





ژیانی ئیمامی ئەبوحەنیفە

نووسینی: محمد ئەبوزەهرە

وەرگێڕانی: عومەر تۆفیق خەطاط

دیزاین: کتێبخانەی گەشە

نۆبەی چاپ: یەکەم، ٢٠٢٠

تیراژ: ١٠٠٠دانە

نرخ: ٣٥٠٠دینار

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارە سپاردنی (١٢١٩)ی ساڵی (٢٠٢٠)ی پێدراوە..

 کتێبخانەی گەشە بۆ چاپو بڵاو کردنەوە

سلێمانی – بازاڕی ئاوباریک بەرامبەر کاسۆ مۆڵ – دوکانی ٧١

٠٧٥٠١٢١٤٧٧٣ – ٠٧٥٠٨٨٢٩٠٨٦




## سوپاس بۆ تۆ پەروەردگار

بۆ تۆکمەکردن و پارێزگاری لە فیقهی ئیسلامی و دارشتنی وردەکارییەکانی. پیاوانی گەورەی (عملاق)ی وەك چوار پێشەواکەی فیقهـ: ((إمام مالك و أبو حنیفه و شافیعی و أحمد))ت بۆ هەڵخستووین.

بۆ پارێزگاری لە بیر و باوەڕی پوختی ئیسلامی کەسانی مەزنی وەك (إبن تیمیه و إبن القیم)و هەڵخستووە.

بۆ پارێزگاری قورئان، موفەسیرینی گەورەت هەڵخستووە بۆمان، وەك إبن عباس و إبن کثیر و طبري و هتد.

بۆ پارێزگاری لە فەرموودەی صحیح: پێشەوا گەلێکی فەرموودەناست بۆ هەڵخستین، وەك: بوخاری و موسلم و ترمزی و نسائی و إبن ماجه و حاکم، سوپاس بۆ تۆ پەروەردگارم.

# پێشەکی

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

من نازانم! لەو ئاستەدا نیم، چ پێشەکییەك بۆ تۆ بنووسم ئەی ئەی زانا شەرعناسە مەزنەکەی عیراق. ئەی پیاوە وردەکارە ژیرەکەی فارس. ئەی ئەو کەسەی بە فەتوا جوان و وورد و بەڵگەدارەکانت موسوڵمانانت لە ناڕەحەتی و ئیحراجی ڕزگار کرد، ئوممەتی ئیسلام تا نەڕۆنە زیارەتی کەعبەی موشەرەفە گەورەیی ئەو فەتوایەی تۆیان بۆ دەرناکەویٚ، کە بە دەست لێکەوتن دەستنوێژ ناشکێت، تۆ نەبوویتایە هەموو دەریای سوور بەشی دەستنوێژی ئوممەتی ئیسلامی نەدەکرد چونکە بەرلێك کەوتن لەویٚ زۆرە.

تۆ هاتیت ڕێزت بۆ ئافرەتان گێڕایەوە و ئیرادەی سەربەستانەت بۆ گێڕانەوە، دەرتخست بۆ هەموو جیهان کە ئافرەتان کاڵایەك نین بەدەست باوك و برا و کەسیانەوە تا بە ئارەزوو بیاندەن بە شوو، بەڵکو تۆ بویت فەرموت: ئافرەت ئەتوانێت خۆی خۆی بدات بە شوو دوای پرس و ڕا بە وەلی ئەمرەکەی. هەر تۆ بوویت ئەی (أبو حەنیفە)کە زاناکانی سەردەمی خۆت، دانیان بەوەدانا کە لە فیقهی

ئیسلامدا زانایەکی لە لوتکەدا و بەکۆی دەنگ ناویان نایت(گەورەترین زانا) و بە (إمام الاعظم) ناوبانگت دەرکرد.

دەی سا خوای مەزن لەباتی ئێمە و هەموو ئوممەتی ئیسلام پاداشتی خێرت بداتەوە. ئەی (نوعمانی کوڕی ثابت).

***

## مامۆستا و زانا (محمد أبو زهرە) کێیە؟

پێشەوا(محمد أبو زهرە) زانایەکە لەوە گەورەترە بمانەوێت بیناسێنین. کەس گومانی لەوەدا نییە کە بێ ڕکابەر زانای سەردەمەکەی خۆی بووە.

بەڵام ئەو مافەی بەسەرمانەوە هەیە و خوێنەریش مافی ئەوەی هەیە کە بزانێت ئەو پیاوە کێیە؟ ئەگەر لە چەند دێڕێکیشدا بێت. کە باس لە لەدایك بوونی و ئەو بارو زروفەشی کە تیایدا لەدایك بووە و ژیاوە، لەگەڵ باسی هەڵوێستە مەردانەکانی لە بواری چاکسازی کۆمەڵایەتی و ئیسلامی، ئیتر با مەسەلەکە گەیشتبێتە ئاستی ئەوەی لەڕووی دەسەڵات بووەستێتەوە.

ئەم پێشەوایەش ناوی (محمدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی موستەفای کوڕی عبدالله یە)، لە ساڵی ١٢١٦ی کۆچی لەدایك بووە، کە٢٩ی

مانگی مارسی ساڵی١٨٩٨زاینی دەکات. لە شاری (مَحَلة الکبری) کە یەکێکە لە پارێزگاکانی ڕۆژئاوای میسر.

خانەوادەکەی(أبو زهره)ئەگەڕێتەوە بۆ بنەماڵە ناودارەکان، هەر چەندە خۆی شانازی پێوە نەکردووە وەك زۆرێك لە خەڵکی، کە سوك و سەلیمی خۆیانیان پیێ دادەپۆشی. کە لەڕاستیدا شایانی ئەو مەقامەش نەبوون.

مامۆستا(أبو زهره)سەرەتای ژیانی زانستی وەك هەموو زاناکانی تری ئەزهەر لە حوجرەوە دەستی پێکرد. پاشان چووە قوتابخانەی سەرەتایی و تیایدا فێری نووسین و خوێندنەوە بوو.

دواتر خۆی گەیاندە قوتابخانە پێشکەوتووەکان و لەهەموو قورئانی پیرۆزی لەبەرکرد، لەگەڵ زانسە شارستانییەکانی وەك: جوگرافیا و بیرکاری. ئەمەو لەگەڵ زانستەکانی زمانی عەرەبیدا.

لەساڵی١٩١٢ دا خۆی گەیاندە(جامع الاحمدی) لەشاری تەنتا، لەویێ لێهاتوویی و سەرکەوتنی بەسەر هاوتەمەنەکانیدا دەرکەوت، کە بوو بە جێگای سەرسامی چواردەورەکەی لە مامۆستا و قوتابییەکان. لەساڵی١٩١٦ پێشەوا خۆی گەیاندە قوتابخانەی دادگای شەرعی، بەهۆی ئەوەی کە لە تاقیکردنەوەی وەرگیرانیدا یەکەمی نار هەموو هاوڕێکانی بوو، بەمەرجێ لە هەموویان منداڵتر بوو و کەمتریشی خوێندبوو لەوان.

پێشەوا(بە ڕەحمەت بێت)چەند نازناو و پۆستی پێدراوە لەنێوان کۆلیژی بنەماڵەکانی ئاین و کۆلیژی مافداو لەنێوان قۆناغەکانی مامۆستایەتی. هەر لە مامۆستای یاریدەدەر بۆ مامۆستای کورسیدار تا گەیشتە سەرۆك بەشی شەریعە.

تا ئەوە بوو لەساڵی١٩٥٨خانەنشین بوو، لەساڵی١٩٦٢ هەڵبژێردرا بە ئەندامی کۆڕی لێکۆڵینەوەی ئیسلامی لە زانکۆی ئەزهەر، کە جێگرەوەی ئەو کوڕە گەورە بوو کە پێشتر پێی دەوترا ((دەستەی زانا گەورەکان)).

پێشەوا باسی خۆی دەکات و دەڵێ:

((ژیانم تێکەڵ بوو لەنێوان تاڵی و شیرینیدا. ژیانی زانستیم لەوەوە دەستی پێکرد چوومە حوجرەو قورئانی پیرۆزم تەواوکرد. ئەگەر ڕووەك پێش ئەوەی سەردەربێنێ لە زەوی و تۆوە لەڕێگای میکرۆسکۆبەوە ئەزانین ئەو تۆوە چی لەخۆیدا حەشارداوە. ئێمەش هەر بەهەمان شێوە، هەر لە منداڵییەوە هەموو تایبەتمەندییەکانی گەورە بوونم تێدایە، من هەر لەکاتی حوجرەوە هەستم بەوە کرد دوور شتم تێدایە کە دواتر لە گەورەبوونمدا دەرکەوت:

یەکەم: شانازی کردنم بە خۆم و هزرمەوە، تا وام لێهات پێیان ئەوتم منالێکی ئینکار. دووەم: دەروونم ئەهاتەوە یەك لە داگیرکردنی ناڕەوا)).

بەهۆی ئەم دوو خاڵەوە ژیانی مامۆستا (أبو زهرە) بریتی بوو لە زنجیرەیەك مەردایەتی لەپێناوی هەقدا دژی ناهەق تیَ ئەكۆشی، کاتێك دونیاکەمانی بەجیَ هێشت یەك سامانی گەورەی دەربارەی – زانستە شەرعییە ئیسلامی یەکان–بۆ بەجیَ هێشتین لە هەموو بوارەکانیدا.

بەڕاستی مامۆستا کانزایەکی لەبن نەهاتوو بوو، کانیاوێك کە تا ئێستاش ژوانگەی تینووەکانە لەگەڵ زۆری ژمارەیاندا. بەر ڕەحمەتی فراوانی خوا کەوێت و پاداشتی ئەو زانایانەی پێبدات کە تەنها و تەنها مەبەستیان گەورەیی و بەرزی ئیسلام و موسوڵمانان بووە.

محمد محمود الخضري

***

# پێشەکی چاپی یەکەم

حەمدو سەنا بۆ پەروەردگاری جیهان. درووود و سەلامیش لەسەر گیانی پێغەمبەرمان محمد و هاوەڵان و خزمانی. پاشان:

وا بۆ ئەم ساڵی بەشی خوێندنی باڵای شەریعە، ژیانی ئەبوحەنیفەم هەڵبژاردوو ژیان و بۆچوونە فیقهییەکانیم تاوتوێ کرد. تیایدا توانیومە دیراسەیەکی ووردی ژیانی و بیر و بۆچوون و هزریم کردووە. تا وێنەیەکی ڕاستەقینە بدەم بە خوێنەر و بیسەر. کە تیایدا ئەو تایبەتمەندی و ڕەوشتانە بخەمە ڕوو کە خوای گەورە ئەو زانا مەزنەی پێ تایبەتمەند کردووە.

هەموو ڕایەکانیم هێناوە لەبواری بیر و باوەڕ و فەتواداان و قیاسەکانی دا، ئاشکرایشە باسکردن لە ژیانی ئەبوحەنیفە و نەقڵکردنی لە کتێبە مێژوویی و ژیاننامەکان شتێکی ئاسان نییە. چونکە شوێنکەوتوانی ڕێڕەوەکەی زۆر ڕۆچوون لە پیاهەڵدانیدا و لە زانایەکی فیقهزان بەرزتر سەیریان کردووە، نەیارانیشی زۆر ڕۆچوون تیایدا و تەنانەت پلەی موسوڵمانەتیشی لێ ئەسەننەوە کە دەبێت ناموس و دینی پارێزراو بێت، لەنێوان توانج دەران و پیاهەڵدەراندا. بەڕاستی عەقڵی لێکۆڵەرەوە ئەوەستێت کە بە تەنها بەدوای ڕاستیەکاندا ئەگەڕێت. نە بەدوای ناتەواوییەکاندا بگەڕێ و نە لە

خۆشەویستیشدا ڕۆبچێت. لەم وون بوونەش ڕزگاری نابێت مەگەر بە زەحمەت و ناڕەحەت بوون. ئەگەر بگاتە وێنەیەکی ڕاستەقینەی ئەو کەسایەتییە ئەوە ئەنجامی ماندووبوون و زەحمەتەکەی دەستکەوتۆتەوە. منیش وا دەزانم گەشتوومەتە ئەو وێنەیە، بەهەموو سێبەر و ڕووناکییەکانییەوە و لەپێناو ئاشکراکردنیدا سەردەمەکەیم ڕۆشن کردۆتەوە، هەندێ بە درێژی لەسەر تاقم و کۆمەڵەکانی سەردەمەکەی دواوم، ئەوانەی کە دەرکەوتووە (ئەبوحەنیفە) گفتوگۆی لەگەڵ کردوون و فێرگردی بووە لەگەڵیاندا.

ڕاوبۆچوونەکان تاوتوێ کراوە لەنێوانیاندا، چونکە باسی ئەو تاقم و دەستانە خۆی بۆ خۆی گیانی ئەو سەردەمە ئەخاتە ڕوو کە چۆن بەچ ڕێڕەوێك بیریان کردووەتەوە، چۆن لە مەسەلە فیکرییەکاندا بەزیون بۆ ڕای بەرامبەر، دوای ئەوە باسی ڕاو و بۆچوونیم کردووە لە مەسەلە سیاسی و بیروباوەڕەکانیدا.

کە ئەوەش پێویستە باسکردنی، چونکە ئێمە لەمیانەی باسکردنی ژیانی بیرمەندێکین لەهەموو ڕووەکانییەوە، ڕاو بۆچوونە سیاسییەکانی کاریگەرییان هەبووە لەسەر ڕێڕەوی ژیانی و باسنەکردنی واتە پشتگوێخستنی زۆر پەیوەندیدار خودی خۆی و بیر و دڵ و دەروونییەوەیە، ڕاوبۆچوونەکانی لە مەسەلەی بیروباوەڕدا

زۆر خاوێنتر بوو لە هەموو ئەو ڕاوبۆچونانەی لەسەردەمەکەی ئەودا باوی هەبووە.

کاکڵەیەکی خاوێنی ڕای ئەوانەبوو کە لە هەڵخلیسکان و ڕۆچوون بەدوور بوون، کە ئەوەش خۆی بۆ خۆی ڕای ڕاستەقینە و تەواوی کۆمەڵی موسوڵمانانە و ناوکرۆکی ئاین و گیانی دڵنیابوونە.

تا دەگەینە پوختەیەکی خاوێن لە ژیانی فیقهی ئەم کەسایەتییە، کە ئەوەش مەبەستی سەرەکیمانە لەم توێژینەوەیە، سەرەتا بەوە دەستمان پێکرد کە ئەو بنەما گشتییانە ڕوونبکەینەوە کە بۆ هەڵگوزینی حوکمی شەرعی کاری لەسەر کردوون، کە پرۆگرامی ئەو دیاری دەکات، شێوازی دەرهێنانی ڕایە فیقهییەکانی ڕوون دەکاتەوە. لەم لایەنەوە پشتمان بەستووە بەو حەنەفییانەی کە باسیان لەو بنەمایانەی کردووە کە گەڕێنراونەتەوە بۆ پێشەوا خۆی و ڕێگاکانی ئیسنادکردنی. لەمەشدا هەوڵمانداوە بە کورتی باسی لێوە بکەین و نەچینە درێژییەکەی، واتە بەشێوەیەکی گشتی بێت نەك وردەکاری. نەهاتووین باس لە هەموو ئەو بنەمایانە بکەین کە باسیان لێوە کردووە بە سەنەدێکی ڕاست نەگەیەنراوەتەوە بۆ ئەبوحەنیفە خۆی، کە بە هەوڵی زانایانی دوای خۆی دائەنرێت و نادرێتە پاڵ پێشینەکان.

تا ئەگەینە ڕۆشنکردنەوەی مەبەستمان، کە ئەویش زانینی پرۆگرامی پێشەوا. تا دەگەینە دیراسەکردنی هەندێ لق و وردەکاری کە ڕەنگدانەوەی ڕاو و بۆچوونی تاکە کەسی خۆی و ژیانی خۆیەتی بەجوانترین مانا. وەك هەندێ بەشی فیقهی کە پەیوەندی هەیە بە ئیرادەی سەربەستەوە سەبارەت بە پارە و سامانەکەی، وەك ئەو بەشانەی پەیوەندیان هەیە بە بازرگان و بازرگانییەوە، وەك بەشەکانی قازانج کردن ویلایەت و سەلەم کردن. ئەم باسانەشمان بە درێژی نەهێناوە، بەڵکو تەنها لەبەر عەقڵ و ژیری سەربەستانەی پێشەوا دەربخەین کە چۆن دەرکی کردووە بە بازرگانی دەستپاکانە و بازاڕی ئازاد، ویستوویەتی مەبەستی سەرەکی لەو کارانە دەستکەوتنی دەستپاکی لەپێش هەموو شتێکەوە بێت.

زانایان دەڵێن (پێشەوا) یەکەمین کەس بووە دەربارەی (حیلە شەرعی) قسەی کردووە، کەواتە پێویستە لەسەرمان فیکرە و مەبەستەکەی ئەو ئاشکرا بکەین، هاوکێشەیەك لەنێوان ئەوەی لەوەوە سابت بووە و ئەوەشی دەربارەی وتراوە.

لە هەموو ئەمانەی کە باسی ئەکەین، چ پرۆگرامی بەگشتی بێت یان لق و بەشە فیقهییەکانی بێت، گەورەیی و بیرمەندی پێشەوا دەرئەخات. لەگەڵ بوونی جیاوازی بیروڕا لەنێوان ئەو و هاوڕێکانیدا، چونکە ڕوونکردنەوەی جیاوازییەکان ڕێڕەو و بیرکردنەوەی کەسە

جیاوازەکان دەردەخات. ئەگەر لەم باسەدا گەیشتینە مەبەستێکی گەورە و جوان کە ئەویش ئاشکراکردنی عەقڵیەتی زانستی درەوشاوەیە، دەی کەواتە بۆ تەواوکردنی باسەکە باسێکی زاناکانی دوای ئەو بکەین کە بوونە هەڵگری مەزهەبەکەی، کە بە کەلەپورێکی گەورەی پێشەوا دادەنرێت، کە نەوەکان چییان لێ وەبەرهێنا لە: ڕێکەوتی عورفە جۆراوجۆرەکان و ئەندازەی دەرهێنان تیایدا و نەرمی بنەما گشتییەکانی لەبواری (تخریج)داو، جوانی دەرهێنانی ڕاو فەتوای نوێ لەگەڵ گۆڕانی زەمانەدا، هێشتنەوەی لەسەر پرۆگرامی ئیسلامی و ڕێبازی قورئان و سوننەی دروست و ڕێگا ڕاستەکەی.

شایانی ئەوەشە دان بە ئەوەدا بنێین کە هاوکاری و کۆمەکی خوا لە هەموو ئەو کارانەدا زۆر گەورەیە و ئەگەر ئەو یارمەتییە مەزنەی خودا نەبوایە، هەرگیز نەدەگەشتینە ئامانجەکەمان و هیچ ئامانجێکیشمان نەدەپێکا. دەسا لێی دەپاڕێینەوە بە توانایی خۆی دەستی یارمەتیمان بۆ بهاوێت و سەرکەتوومان بکات و خوایش لە سەرووی هەموو مەبەستێکەوەیە.

سالی ١٣٦٤کۆچی

بەرامبەر سالی١٩٤٥زایینی

(محمد ئەبو زەهرە)



# ڕێخۆشکەر

١. لە کتێبی (الخیرات الحسان)دا هاتووە دەڵێ:

(( ژیری و لێهاتوویی پیاوانی سەردەمی پێشوو خەڵکی تێڕوانینیان جیاواز بووە بۆی، ئەی نابینی عەلی کوڕی ئەبو طالیب(خوا لێی ڕازی بێت)دووچین ڕەنجەڕۆ بوون تیایدا: خۆشویستنی سنوربەدەر، ڕقێکی ڕۆچوو)).

بەڕاستی ئەم وشە ڕاستە زۆر ڕاستە و بەسەر پێشەوادا پڕاوپڕ جێبەجێ دەبێت. کۆمەڵە کەسانێك ئەوەندە لە ڕادەبەدەر خۆشیان ویستووە بردویانەتە ئاستی پێغەمبەران، وا ئەزانن تەورات موژدەی هاتنی داوەو محمد المصطفی(صلی الله علیه وسلم) لە فەرموودەکانیدا ناوی هێناوە، گوایە فەرموویەتی (سراج أمتی)واتە چرای ئوممەتەکەم، تەنانەت هەندێ ڕەوشتی وای دەدەنە پاڵ کە ئاستی خۆی تێئەپەڕێنێت.

لە بەرامبەریشدا کۆمەڵە کەسانێك زۆر ناحەزایەتی پێشەوا ئەکەن و تەنانەت بە لەدین دەرچوو وەسفی ئەکەن. دەڵێن دینی تێك داوە و سوننەتی فەرامۆش کردووە و بەڵکو هەڵیشی وەشاندۆتەوە، چەندان فەتوادانی بێ بەڵگە و بنەمایەکی ئاشکرا. ئیتر ئەم تاقمە لە سنوری ڕەخنەگرتن دەرچوون و بە دیراسەیەکی ورد و پشکنینێکی جوان مامەڵەیان لەگەڵ ڕاو بۆچوونەکانی نەکردووە .

هەر بەوەوە نەوەستان کە بلێن بێ بەڵگەو بنەما قسەی کردووە، بەڵکو وەك دژایەتییەکی توند هاتوون دین و ئیمان و کەسایەتییەکەیان لەکەدارکردووە.

٢. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە پێشەوا (ئەبوحەنیفە) هێشتا زیندووبوو وانەی بە قوتابییەکانی دەوتەوە، لە مەسەلە فەتواییەکاندا قسەیان دەکرد، ڕیوایەتی فەرموودەکانیان تاوتوێ ئەکرد، بنەماکانی قیاسیان دادەنا و هۆکاری حوکمەکانیان ئەدۆزییەوە تا حوکمی تازەی لەسەر بنیات بنێن و ئیجتیهادەکانیان بە دروستی لەسەر هەڵئەچنی.

بۆ ئەم هەموو ڕا جیاوازە لەسەر ئەم زانایە؟ ئەمەش زۆر هۆکاری هەیە کە لەم کتێبەدا بەهەندێ دوورودرێژی لەسەری ئەڕۆین. بەڵام لێرەدا باس لە هۆکارێك دەکەین کە وەك بنچینە وایە بۆ ئەوانی تریش، ئەمەش لەبەر ئەوە بووە کە ئەبوحەنیفە هێزێکی کەسایەتی گەورەی وای هەبوو، کە وای لە ڕێڕەوی فیقهییەکەی کردبوو لە هەڵقەو دەرسەکانی دەرچوو بوو. بەڵکو لە هەرێمەکەی چووە دەرەوە و بەناو هەرێمە ئیسلامییەکاندا بڵاوبوویەوە.

لەهەموو ناوچەکانەوە خەڵکی لەسەر ڕاکانی(پێشەوا)قسەیان دەکردو چ نەیاران و چ دۆستانی دەیان بیست. نەیارەکان بەدڵیان نەبوو دۆست و لایەنگرەکانیش پشتگیریان دەکرد.

دەستەی یەکەم نەیارەکان: (ئەوانەی دەست بە دەقەوە دەگرن گوێ بۆ شتی تر ناگرن)، شتێکی بیدعەو داهێنراوی هیناوە لە دینا، بەتوندی ڕەدیان کردۆتەوە، خۆ لەوانەیە تەقواو وەرعی پێشەوایان بدیایە، ئا بەو جۆرە زمانیان نە ئەهاویشت بۆی.

ڕەئیەکەی ئەبینی بەڵام بەڵگە و هۆکارەکانیان پێ نەگەشتبوو. خۆ لەوانەیە ئەگەر بە وردی لە بەڵگەکانی بکۆڵنەوە، ڕێزی لێبگرن و بچنە سەر ڕەئیەکانی ئەو. لەو بارەیەوە دەڵێن پێشەوا ئەوزاعی کە بە فەقیهی شام ناسرابوو و لەسەردەمی ئەبوحەنیفەدا ژیاوە و جارێك بە (عبدالله)ی کوڕی موبارەکی وت:

ئەو بیدعە چییەی لە کوفە هەڵکەوتووە و پێی دەڵێن ئەبوحەنیفە؟ عبدالله هیچ وەڵامێکی نەدایەوە، بەڵکو هەندێ مەسەلەی فیقهی گران و ڕێگاکانی تێگەیشتن لێی و فتوادان تیایدا باسکرد.

ئەوزاعی وتی: ئەم فەتوایانە هی کێن؟ وتی هی زانایەك بوو لە عێراق بینیم، ئەوزاعیش وتی: ئەمە بەڕاستی زانایەکی هەڵکەوتەو مەزنە و ئەڕۆم سودی لێ وەردەگرم. وتی: ئەو زانایە ئەبوحەنیفەیە.

کاتێك لەیەك جیابوونەوە، ئەوزاعی بە عبداللە ی کوڕی موبارەکی وت: بەڕاستی خۆزگە بە زانستی زۆر و عەقڵ و ژیری وردی ئەو پیاوە دەخوازم، داوای لێخۆشبوونەکەم لەخوا، من لە هەڵەیەکی ئاشکرادا بووم ، ئەوەی بیستم بە پێچەوانەی ئەوەوەیە کە بۆ منیان باس کردبووە)[1].

پێشەوا (ئەبوحەنیفە) لەگەڵ ئەوەی خاوەنی کەسایەتییەکی بەهێز و کاریگەرییەکی قووڵ و هەژموونێکی بەهێز بووە، خاوەنی شێوازێکی نوێ بووە لە بواری فەتواو دەرهێنانی فەرموودە و لە فەرموودە گەیشتن و دەرهێنانی حوکمی شەرعی لێی. ئەم شێوازانەشی لە قوتابییەکانیدا ڕوواندبوو بەدرێژایی ماوەی سی ساڵ و زیاتریش. جا کەسێك ئاوابێت ئەوە جێگای ئەوەیە بە ڕەخنەی تاڵ و ترش بەئامانج بگیرێ، نەك ئەوەندە بەڵکو کەسایەتیشی لەکەدار بکرێت و ڕایەکانی بەچەوت بگیرێت و دەمارگیری بکەن بەرامبەری.

٣. لە سەدەی چوارەمی کۆچیدا ناکۆکی و کێبڕکێ توندبوو لەنێوان لایەنگران و نەیارانیدا، کەلەو کاتەدا دەمارگیری مەزهەبی زاڵ بوو. مەسەلە فیقهییەکان بوونە جێگای مشتومڕ و دەمەقاڵێ، کار گەشتە ئەوەی لە ماڵەکان و مزگەرت و تەنانەت ڕۆژی

[1] الخیرات الحسان لا ٣٣

پرسەکانیش کرابوونە جێگای گفتووگۆ و دەمەقاڵە، دەربارەی مەزهەبەکان. هەریەکە و پێشەواکەی خۆی سەرئەخست و دەمارگیربوو بۆی. هەر لەم سەردەمەدا چەندان کتێب لەبارەی گەورەیی و لێوەشاوەیی پێشەوای مەزهەبەکان نووسرا، کە هەر هەمووی پڕە لە پیاهەڵدانی لە ڕادەبەدەری پێشەواکان و بریندارکردنی بەرامبەرەکانیان.

تەنانەت کێبڕکێ و ناکۆکییەکە زۆر توند بوو لەنێوان لایەنگرانی حەنەفییەکان و شافیعییەکان. بۆیە ئەم دوو زانایە زیاتر لە زاناکانی تر ڕووبەڕووی تانە و توانجی تاڵ بوونەتەوە. بەڵکو هەندێ لە شوێنکەوتووانیان هەندێ ڕەوشت و ئاکاریان داوەتە پاڵیان کە ئەوان نەیانویستووە و خۆیانیان لەبەردەمی خوا لێ بەری کردووە.

پێشەوا (ئەبوحەنیفە) زیاتر لە زاناکانی تر کراوەتە ئامانجی توانج لێدان، چونکە فەتوایەکی زۆری هەیە کە ڕای خۆی نییە. ئەمەش کەلێنێکی تر بوو بۆ لێدانی لەبواری فەرموودەدا. لەخۆپاراستنی لە گوناهـ—الورع—و جوان فەتوادان و شت گەلێکی تریش کە پەیوەندی بە مەزهەبەکەیەوە هەیە لەبواری دەرهێنانی حوکم و تەخریجی فەرموودە. دەمارگیرەکان بەشێوەیەکی بێ ڕەحمانە تیر هاوێژییان کردووە و گوێیان بەوە نەداوە کە حورمەتی بپارێزن، تەنانەت هەندێ

له زانا شافیعییه‌کان ئه‌مه‌یان پێ ناخۆش بووه و به گوناهـ و تاوان و له‌ڕێگالادان سه‌یریان کردووه.

له‌وانه که به ویژدانه‌وه بۆ ئه‌بوحه‌نیفه‌یان ڕوانیوه و کتێبیان له‌باره‌ی چاکییه‌وه نووسیوه و قسه و بۆچوونی ده‌مارگیره‌کانی نێو شافیعییه‌کانیان ڕه‌دکردۆته‌وه، له‌وانه (السیوطي) که پیاوێکی ناوداری ناو شافیعی مه‌زهه‌به‌کانه و سه‌باره‌ت به ئه‌بوحه‌نیفه کتێبێك ده‌نووسێت به‌ناوی: ((خاوێنکردنه‌وه‌ی سه‌حیفه له چاکییه‌کانی پێشه‌وا ئه‌بوحه‌نیفه))، یان (إبن حجر الهیثمي المكيّ) کتێبێك داده‌نێت به‌ناوی ((الخیرات الحسان في مناقب الامام الاعظم أبي حنیفه النعمان))، پێشه‌وا(الشعراني)له کتێبی(المیزان)دا یه‌ك به‌شی تایبه‌ت ده‌كات به باسی پێشه‌وا و به‌رگریكردن لێی و ڕاست و ڕه‌وانی ده‌رهێنانی فه‌رمووده‌كان، له (الطبقات) ناوی بردووه به یه‌كێ له دۆستانی خودا و په‌یوه‌ست به په‌روه‌ردگاره‌وه.

٤. نووسه‌ر كه باسی پێشه‌وا ده‌كات ڕێگاكه‌ی واش ئاسان و سارا نییه، چونكه خۆی له‌به‌رده‌م كۆمه‌ڵێ هه‌واڵی تێكه‌ڵ و پێكه‌ڵدا ده‌بینێته‌وه، كه تیایدا گه‌وهه‌ره‌كه له‌گه‌ڵ قوڕه‌كه‌دا تێكه‌ڵ بووه، به‌جۆرێ كه بۆ جیاكردنه‌وه‌ی پێویست به تواندنه‌وه و جیاكردنه‌وه هه‌یه و گه‌وهه‌ره‌كه‌ش وا وردوخاش بووه ئاڵتون دۆزه‌كه به‌ئاسانی نایدۆزێته‌وه، كه هزر و نه‌فسیه‌تی له یه‌ك جیایه و پێویستی به‌وه

هەیە پارچەکان بدرێنەوە لەیەك، تا یەکەیەکی وای لیَ پێکبێتەوە بتوانێت عەقڵیەت و نەفسیەت و پرۆگرامی دەرهێنانی حوکم و ئەو هۆکارانەی گەیاندوویەتی، ئەو ڕاو بۆچوونانەی کە بە قوتابییەکانی وتۆتەوە لێی تیَ بگات.

چاکییەکان زۆر زۆرن. بەڵام ئەم زۆری ڕێنیشاندەر نییە و ڕێگا ڕووناك ناکاتەوە، چونکە کۆمەڵە هەواڵێکن کە پڕن لە موبالەغەو ڕۆچوون، جا بۆ جیاکردنەوەی ڕاست و ناڕاستەکانی ئەو هەواڵانە، پێویست بە پێوەرێکی ڕەخنەگرانەی دروست دەکات، چونکە خۆ نابێت هەموو ڕەد بکرێتەوە و ناشبیَ لەهەمووی وەربگیرێت، چونکە بێگومان هەواڵی ڕاست و هەواڵی ناڕاستیشی تێدایە. جیاکردنەوەی ڕاستییەکان لە ناڕاستەکان پێویستی بە گەڕان و پشکنینی وردە. وەك نموونەی قازییەکە، کە شایەتێکی بۆ دێنن ڕووداوەکەی بەچاوی خۆی بینیوە، بەڵام لە لایەنێکەوە بۆی دەڕوانێت و ئەوەندە ڕۆدەچیَ لەباس کردنەکەیدا کە لەهەق و ڕاستی دەچێتە دەرەوە.

قازیش لێرەدا گوێی بۆ ئەگرێت و ئەیەوێت لەڕێگای وردەکارییەکانی ئەم شایەتییەوە بگاتە ڕاستی مەسەلەکە، کە لە قسەی شایەتەکەدا هەندیَ نیشانەی دەردەکەوێت، کە بەهۆیانەوە ئەگاتە تاوانەکە و بۆی ڕۆشن دەبێتەوە و هەوڵ دەدات ڕادە و ئاستی موبالەغەکانی شایەتەکە بزانێت و ڕاستییەکانی تێدا ئاشکرا بکات.

٥. ئەگەر توانیمان ژیان و بەسەرهاتی ڕاست و دروستی پێشەوا بزانین و لەگەڵ ئەوەشی کە پێوەی پێچراوە، پاشان هەوڵی تاوتوێکردنی ڕایەکانی بدەین ئەو شتێکی قورسە، چونکە کتێبێك، یان نووسراوێکی خودی پێشەوامان لەبەردەستا نییە باس لە ژیان و بەسەرهات و ڕایەکانی خۆی بکات.

بەڵکو هەموو ئەو شتانەمان لەڕێگای قوتابییەکانییەوە پێ گەیشتووە، بەتایبەت دوو قوتابییەکەی (ابو یوسف) و(پێشەوا محمدی کوڕی حەسەنی شەیبانی) و هەندێ هاوەڵی تر و هەندێ لە زانا عێراقیەکانی هاوزەمانی وەك: (إبن شبرمه) و (إبن أبی لیلی) و (عثمان البتی).

گومانیشی تێدانییە ئەم ڕیوایەتانە ڕاستن و لە ئەبوحەنیفەوە پێمان گەیشتوون، ئەبێ باوەڕیان پێ بکەین و نابێ شتی تر وەرگرین، چونکە زانایان وەریانگرتوون و قبوڵیان کردووە. کەواتە بەپێی کێشانەی زانستی و مێژوویی، نابێت واز لە هەواڵ گەلێك بهێنین کە زانایان قبوڵیان کردووە و باوەڕیان پێ کردووە، مەگەر بەڵگە هەبێت لەسەر نادروستی یان ڕاستی پێچەوانەکەی.

٦. بەڵام ئەگەر تەنها پشت بەگێڕانەوەکانی ئەو دوو زانا گەورەیە ببەستین، باسەکەمان تێرو تەسەل نابێت. هەندێ کەلێنی تێدا

دەمێنێتەوە کەدەبێ دابخرێن، بۆ ئەوەی بە ڕوونی ئەو مەزهەبە مەزنە بخەینەڕوو، چونکە ئەو کتێبانە هەموو ژیان و ڕاکانی پێشەوایان نەقلٚ نەکردووە و هەندێ ڕاوبۆچوونی ئەسڵەن لای ئەوان نەنووسراوە، پێویستی کردووە بۆ دەستکەوتنی زانستی زیاتری پێشەوا لە کتێب و نووسراوەکانی تر سوود وەربگرین، زۆری لەوانەشمان لە کتێبی زاناکانی تری مەزهەبەکەیەوە وەرگرتووە، بینیومانە چۆن زانایان هەندێ لەو ڕیوایەتانە بە بەهێزتر دەزانن لەوەی کە پێی دەڵێن (ظاهر الروایە) کە کتێبەکانی محمد کوڕی حەسەنی شەیبانییە، بەڵام ئەمە لە هەندێ حاڵەتی کەمدا.

زاناکان بەگشتی (ظاهر الروایە)بە بەهێزترین ڕا بۆی دەڕوانن و هەموو ڕایەکانی تر بە شازو کەم باو سەیر دەکەن. هەر چۆنێك بێت ئەم هەڵبژاردنە –ترجیح–ش دەبێت بە وردی لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت، ئەمەش وادەکات کارەکەمان قورس بێت و هەروا ئاسان نەبێت. لەسەرووی ئەمانەشەوە (محمد) لە کتێبەکانیدا زۆر وتەو ڕای هێناوە بەڵام ئاماژەی بۆ بەڵگەکانی نەکردووە، وتەکان هی پێشەوا (ئەبوحەنیفە)ن، بەڵام وتە گەلێکی بێ گیانە کە بەڵگەکانیەتی.

گومانی تێدانییە، کە دیراسەکردنی بە تەنها بەس نییە بۆ ئەوەی وێنەیەکی دروسی پێشەوامان دەست کەوێت، کە بە زانای(ڕەئی)ناوی دەرکردووە، کە ناتوانێ وێنەیەکی ڕاستگۆیانەی

ڕێڕەوی کارکردنی بە (قیاس) و دەرهێنانی هۆکارەکان(العلل)لە دەقەکان و گشتی کردنی لە ئەحکامەکانی و کارکردن لەسەر ئەم هۆکارانە. بۆیە پێویستە دیراسەیەکی وردی پێشەوا(ئەبوحەنیفە) وەك زانایەکی قیاسزان بکەین، کە چۆن بە بەڵگەکانی ئاشنا ببین لەڕێگای لێکدانەوە و ڕوونکردنەوەکانی زاناکانی دواتر لەسەر کتێبەکانی محمد. لە شەرحی ئەم زانایانەوە قیاسەکانی پێشەوا ئەبوحەنیفەمان بۆ دەرئەکەوێت. لەبەر ئەوە نییە کە لەو باوەڕەداین ئەمانە هەمووی لە ئەبوحەنیفە بیستراوە، بەڵکو لەو قوتابییانەوە بیستراوە کە قوتابییەکانی پێشەوایان بینیوە.

بۆیە ئەگەر ئەم بەڵگانەش ڕاستەوخۆ پێشەوا باسی نەکردبێت، خۆ نزیکە لە قیاسەکانی ئەوەوە، ڕوونکەرەوەیەکی باشە بۆ هۆکارەکانی کەوای کردووە ئەو پێشەوا مەزنە کاری بە قیاس کردووە.

* * *

# ژیانی ئیمامی ئەبوحەنیفە

١. لەدایك بوون و نەژادی:

لەساڵی(٨٠)ی کۆچیدا لە شاری کوفە لەدایك بووە و ئەمەش هەموو مێژوو نووسەکان لەسەری کۆکن.

ڕیوایەتێکیش هەیە دەڵێ ساڵی(٦١)ی کۆچی لەدایك بووە، بەڵام کەس پشتگیری ئەم ڕیوایەتەی نەکردووە و هەروەك لەگەڵ کۆتایی ژیانیدا ناگونجێت، چونکە هەموو ڕیوایەتەکان لەسەر ئەوە کۆکن لەساڵی لەساڵی(١٥٠)ی کۆچی لەدونیا دەرچووە، لەدوای ئەوەی کە خەلیفە مەنسور زیندانی کرد-ئەگەر- (٦١)ڕاست بێت تەمەنی(٩١)ساڵ دەکات، ئەمەش وانییە، چونکە هیچ ڕیوایەتێك باس لەوە ناکات کە پێشەوا بیانووی پیری هێنابێتەوە بۆ مەنسور، کاتێك داوای لێکرد بەزۆر ببێتە قازی، چونکە کەس لەو تەمەنەدا داوایەکی ئاوا گەورەی لێ ناکرێت کە لە ئاستی وەزیری دادی ئەمڕۆدایە، ئەویش لە بەرپرسیارێتی ترساوە کە پۆستی قازییەتی ڕەدکردۆتەوە.

٢. باوکی ناوی(ثابت)ی کوڕی(زوطی)فارسییە و باپیری خەڵکی کابول بووە کە پایتەختی ئەفغانستانە، باوکیشی لە کوفە ژیاوە و هەندێ دەڵێن لە (تورمز) و، هەندێکی تر دەڵێن لە (نسساء)،

هەندێکی تر دەڵێن لە(ئەنبار)ەوە هاتووە بۆ کوفە، بەڵام مێژوونووسان بەدووری نازانن لەهەر سێ جێگاکە ژیابێت.

باوکی پێشەوا کە ناوی (ثابت)ە، بەدیلی دەکەوێتە دەستی موسوڵمانەکان دەبێتە موڵکی پیاوێکی بەنی تەمیم و دواتر ئازاد دەکرێت، بەردەوام سۆزی خزمایەتی بۆ بەنی تەمیم هەبووە. ئەم ریوایەتەش حماد کە کوڕی ئەبوحەنیفەیە دەیگێڕێتەوە. هەر چەندە ئیسماعیلی برای بۆچوونی تری هەبووە و وتوویەتی: سوێند بەخوا هەرگیز کۆیلە نەبووین. گومانی تێدا نییە کە دوو نەوەکەی پێشەوا (حماد و ئیسماعیل) ڕای جیاوازیان هەبووە لە نەژادی باوکیاندا. لەباوانی پێشەوادا ناکۆکیان هەیە کە حماد دەڵێ ناوی(زوطي)بووە لە کاتێکدا(ئیسماعیل)دەڵێ ناوی نوعمان بووە.

خاوەنی کتێبی (خیرات الحسان) دەڵێ: لەوانەیە باوانی ئەبوحەنیفە دوو ناوی هەبووبێت. ئەمە ڕێی تێدەچێت بەڵام ئەوەی کە گوایە مەبەستی (ئیسماعیل) ئەوە بووبێت کە باوکی کۆیلە نەبووە، وانییە چونکە (ئیسماعیل) زۆر بەدڵنیاییەوە دەڵێ هەرگیز کۆیلە نەبووین[٢].

---

[٢] هەرچەندە من پێم وایە، کۆیلایەتی بوونی باپیریان و بەدیل گرتنی هیچ نەنگی نییە تا خۆیانی لێ بەری بکەن، (وەرگێڕ).

٣. مێژوونووسە متمانە پێکراوەکان لەسەر ئەوەن کە خەڵکی فارسە و بەهیچ شێوەیەك عەرەب و بابلی نییە، وەك هەندێ لە عەرەبە دەمارگیرەکان بۆی ئەچن. مەسەلەی دیلی و بەکۆیلەکردنی باپیری و باوکیشی هیچ لە پلە و مەقامی پێشەوا کەم ناکاتەوە، چونکە ئەو ناو و شورەتە مەزنەی لە زانست و ژیری و لەخواترسانەکەیەوە وەرگرتووە .

دەڵێن جارێکیان یەکێك لە تەمیمییەکان پێی دەڵێت: تۆ کۆیلەی ئێمە بوویت و ئازادمان کردوویت. ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت: ((أنا وَالله أشرَف لَك فيكَ لي)) واتە: سوێند بەخوا من هۆی شانازیم بۆ تۆ تا تۆ بۆ من.

(إبن عبدربه) لە کتێبی(العقد الفريد)دا دەڵێ: (إبن أبی ليلی) پێی وتم: عیسای کوڕی موسا کە بەرپرسێکی زۆر ڕەگەز پەرست بوو- عەرەب چێتی ئەکرد- وتی زانای عێراق کێیە؟

دەڵێ وتم: (حسن)ی کوڕی(أبی الحسن).

وتی: نەسەبی چییە: دەڵێ وتم: مەوالییە (واتە کۆیلە ئازادکراوەکان) وتی: ئێ دوای ئەو؟ وتم: (محمد)ی کوڕی(سیرین)، وتی ئەی ئەو چی بورە؟ وتم هەر مەوالی بووە. وتی: ئەی زانای مەککە کێیە؟ وتم: عەتای کوڕی ئەبی ریباح و موجاهید و سەعیدی کوڕی جوبەیر و سەلمانی کوڕی یەسار.

وتی: چی بوون؟ وتم: هەر مەوالی. وتی: ئەی زانای شاری مەدینە؟ وتم: زەیدی کوڕی ئەسلەم و محمدی کوڕی مونکەدیر، و نەجیحی کوڕی(ابن نجیح) وتی: ئەی ئەوانە چی بوون؟ وتم هەر مەوالی. ڕەنگی گۆڕاو پرسی: ئەی زانای قوباء؟ وتم(ربیعە الرأی) و(ابن ابی) زەناد، وتی: ئەو دووانە چی بوون؟وتم: لە مەوالی.

دەموچاوی هێنایە یەك و وتی: ئەی زانای یەمەن؟ وتم: طاووس و کوڕەکەی(ابن منبە) وتی: ئەوانە چی بوون وتم: مەوالی، کە وام وت ڕەنگی لاملی سوور هەڵگەڕاو هەستایە سەرپێ و وتی: ئەی زانای خۆراسان؟ وتم: عەتای کوڕی عبداللەی خۆراسانی، وتی ئەو چی بووە؟ وتم: ئەویش مەولایە.

ڕووی ڕەش هەڵگەڕاو دەم و چاوی هێنایە یەك و زۆر لێی ترسام. پرسی لێم ئەی زانای شام؟ وتم: مەحکول. وتی: چی بووە ئەو؟ وتم: مەولا بووە. هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو وتی: ئەی فەقیهی کوفە؟ دەڵێ وەڵڵاهی نەترساماىە ئەموت: حاکمی کوڕی عوتبە و حەمادی کوڕی ئەبی سەلمان، بەڵام شەڕ لەناوچاری ئەباری. بۆیە وتم: ئیبراهیمی نەخەعی و پێشەوا شەعەبی. وتی: ئەی ئەو دووانە چی بوون؟ وتم: هەردووکیان عەرەب بوون. هاواری کرد و وتی: اللەاکبر. توڕەبوونەکەی دامرکایەوە[٣].

---

[٣] العقد الفرید-ابن عبدربە بەرگی ٢ ل٢٦١.

کەواتە پێشەوا یەکێکی لە سەدان زانای ناوداری ئوممەتی ئیسلام. کە وەك شەرەف نەژادی ناسراو و بەناوبانگی نەبوو لە ڕێگای زانست و فیقهو لە خواترسانەوە بووبو بە ناسراوترین کەس کە ئەوەش گەورەترین بەخششی خودایە.

## بۆچی زۆربەی زاناکانی ئیسلام لە(مەوالی)بوون؟

١. عەرەب لەسەردەمی ئەمەویەکاندا سەروەری و دەسەڵاتێکی گەورەیان هەبوو، دەبوایە پێشەوایەتی جەنگ و جیهادیان بکردایە، ئەوەش لە وەرگرتنی زانست و لێکۆڵینەوەی فیکری و فیقهی دوورخستبوونەوە، لە بەرامبەردا مەوالیەکان هەستیان کرد بۆشاییەکی گەورە لە ژیانیاندا دروست بووە و دەسەڵات و گەورەیی جارانیان نەماوە. هاتن لە ڕێگەیەکی زۆر پیرۆزەوە جێگای خۆیان کردەوە و لەڕێگەی زانست و زانیارییەوە هاتنەوە ناو مەیدانەکە و سەرۆکایەتی فیکری ئیسلامی و عەرەبی ئەو سەردەمەیان گرتە دەست.

٢. هاوەڵانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) (خوایان لێ ڕازی بێت) مەوالی زۆریان لەبەردەستدا بوو، لەگەڵ خۆیان بۆ هەموو جێگایەك دەیان بردن و لەسەر ئەو ڕەوشت و ئاکارە جوانانەی کە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)لەسەری گۆشی کردبوون.

مەوالییەکانی خۆیانیان پەروەردە ئەکرد و لە عیلم و زانستەکەیان بەخشییە ئەوان. لەدوای وەفاتی هاوەڵان ئەمان بوون بە ئاڵا هەڵگری زانست و زانیاری، دەبینی زۆربەی تابیعین لەوانن –خوایان لێ ڕازی بێت.-

٣. ئەو مەوالیانە خەڵکی وڵاتانێك بوون کە مەشخەڵی ڕۆشنبیری و زانستیان هەڵگرتبوو، ئەمەش ڕۆڵی هەبوو لە دروست بوونی مەلەکی فیکری و زانستی تیایدا.

٤. عەرەب ئەهلی کار و پیشەسازی نەبوون، تەنانەت بە پیشەیان وتوه(مهنه)، واتە– مرۆڤ بۆ بژێوی ژیانی خۆی پێ ئیعانە دەکات–و زانستیش کە مرۆڤ خۆی بۆ یەکلایی کردەوە دەبێتە پیشە وەك(ابن خلدون)دەڵێت:

((ئەم زانستانە دواتر بوونە مەلەکە و پێویستی بە خوێندن و فێربوون هەبوو، بەگشتی چووبووە ڕیزی پیشەکان و عەرەبیش بە سروشتی بەدەوی خۆیان دووربوون لە پیشە و کار و ئەوە ئیشی شارەکان بووە و نەتەوە عەجەمییەکان شاریان هەبووە کە مەوالییەکان خەڵکی ئەو شارانە بوون)).

***

## ژیان و گەورەبوونی پێشەوا

پێشەوا (ئەبوحەنیفە)لە کوفە ژیاوە. سەردەمی منداڵی تا گەورەبوونی لەوێ بووە و زۆربەی ژیانیشی لەوێ بەسەربردووە. هەرچەندە سەرچاوەکانی بەردەستمان ئاماژە بە ژیانی باوکی ناکەن کە چۆن بووە و خەریکی چ کارێك بووە، بەڵام هەندێ ئاماژە هەن بۆ ئەوەی کە وەزعی ماددی زۆرباش بووە و یەکێك بووە لە بازرگانەکان و موسوڵمانێکی زۆر تەواویش بووە.

زۆرێ لەو کتێبانەی ژیانی ئەبوحەنیفەیان باس کردووە، ئاماژەیان بۆ ڕووداوێك کردووە کە باوکی پێشەوا بە منداڵی ئیمامی عەلی کوڕی ئەبوو(طالیب)ی دیوە، لەو دیدارەشدا باپیری پێشەوا هەندێ شیرینی فالودەی بە دیاری داوەتە پێشەوا عەلی لە نەورۆزدا، ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە وەزعی دارایی باش بووە، کە بتوانێت خواردنێکی شاهانە بە دیاری بداتە گەورەی باوەڕداران کە دەستی هەمرو کەسێ نەکەوتووە لەو کاتەدا.

ئەگێڕنەوە عەلیش (خوای لێ ڕازی بێت) لە بەرامبەردا دوعای خێری بۆ کردووە و داوای لەخوا کردووە بەرەکەت بخاتە ناو نەوەکانییەوە، بەمەشدا دەرئەکەوێت کە موسوڵمان بووە لەو کاتەدا. کتێبە مێژووییەکان ئەوە دووپات دەکەنەوە لە (ثابت) باوکی پێشەوا کەلە ماڵێکی موسوڵماندا گەورە بووە و پێشەوایش بە تەواوی لە

کەش و هەوایەکی موسوڵمانیەتیدا ژیاوە، ئەمەش هەموو زاناکان لەسەری کۆکن مەگەر کەسانێك کە ئاوڕ نادرێتەوە لە قسە و وتە ناباوەکانیان. بۆیە دەبینین پێشەوا پێش ئەوەی دەست بداتە وەرگرتنی زانست و زانیاری، دەستی داوەتە بازرگانی و کار و کاسبی، بە درێژایی ژیانی هەر خەریکی بازرگانی بووە.

ئەمەش وامان لێدەکات بڵێین باوکی بازرگان بووە، گومانیش لەوەدا نییە کە بازرگانی ئاوریشمی کردووە و پێشەواش ئەم کارەی لە باوکییەوە بۆ ماوەتەوە، وەك لە هەموو جێگایەك هەروایە و کوڕ کاسبی باوکی بۆ دەمێنێتەوە، ئەمەش وا دەردەخات کە پێشەوا ئەبوحەنیفە لە ماڵێکی تەواو ئیسلامیدا گەورە بووە، خانەوادەکەشی لە وەزعێکی زۆر باشی داراییدا بووە و دەوڵەمەندەکانیش عادەتیان وابووە منداڵەکانیان خستۆتە بەر خوێندن و هەموو قورئانی لەبەرکردووە. ئەمەش بە ئاشکرا لەو ڕیوایەتانەدا دەردەکەوێت کە باس لەوە دەکەن کە لە هەموو کەس زیاتر قورئانی دەورکردۆتەوە، تەنانەت دەڵێن لە ڕەمەزاندا (٦٠) جار قورئانی خەتم کردووە، خۆئەگەر ئەم هەواڵە زیادەڕەوییەکی تێدا بێت. خۆ ئەوە ئەگەیەنێت کە زۆر قورئانی خوێندووە، لەزۆر لاوە ڕیوایەت کراوە کە قورئانی

لەسەر دەستی (ئیمام عاصم)دا خوێندووە کە یەکێك بووە لە(قراء السبعة)[4].

* پێشەوا لە کوفە لەدایك بووە، یەکێك بووە لە گەورەترین شارەکانی عێراق. دووەمی گەورەترین شار بووە دوای بەسرە. عێراقیش لەو کاتەدا جێگای چەندان مەزهەب و لایەن و گەلان بووە. پێشتریش خاوەنی چەندان شارستانیەت بووە، سریانییەکان پێش ئیسلام لەناو عێراقدا تەشەنەیانی کردبوو، خاوەنی چەندان قوتابخانە بوون، فەلسەفەی یۆنانیەکانیان تیادا بڵاو دەکردەوە لەگەڵ حیکمەتی فارسەکان، لە عێراقیشدا پێش ئیسلام کۆمەڵێ مەزهەبی مەسیحی هەبوون و لەناو یەکدا دەمەقاڵەی بیروباوەڕی زۆریان لەناو یەکدا هەبوو، هەر وەك کۆمەڵێ لە نەتەوە جیاجیا و تێکەڵ و پێکەڵ لەم وڵاتەدا ژیاون کە هەمیشە بوبووە جێگای ئاژاوە و ئاشووب.

چەندان ڕەئی و بۆچوونی دژ بەیەك لەبواری سیاسەت و بنەماکانی بیرو باوەڕدا هەبووە لەوانە: بوونی شیعە، کە لە سەرەتاوە خەواریج و دواتر موعتەزیلەکان. هەروەك بوونی تابعییەکان لەو وڵاتەدا کە زانست و زانیاری هاوەڵانیان بۆ خەڵکی

[4] الخيرات الحسان لا٢٦٥-(عاصم بن ابى الجود).

دەگواستەوە و عیلمی ئاین زۆر بەئاسانی دەست دەکەوت و لایەنە جیاجیا کانیش ناکۆکییەکی زۆریان لە بیروڕاکانیاندا هەبووە.

کە پێشەوا ئەبوحەنیفە چاوی کردەوە، ئەم هەموو ڕەگەزە جیاجیایەی بینی، عەقڵی کردەوە و ئەم بیروڕایانەی بۆ ڕوون بوویەوە. وا دیار بوو لە سەرەتای لاویدا بوو، ئەویش وەك عادەتی وڵاتەکە دەستی دایە دەمەقاڵە لەگەڵ دەمەقاڵەکاران و بە سەلیقە جوان و ڕاستەکەیەوە ڕووبەڕوی ئەهلی ئارەزووبازان دەبوویەوە.

بەڵام زۆرجار بەرەو بازاڕ و دوکانەکەی دەکەوتە ڕێ، هەرگیز بەرەو کۆڕ و وانەی زاناکان نەدەڕۆشت مەگەر بە دەگمەن. تا کار گەشتە ئەوەی کە هەندێ لە زاناکان هەستیان کرد بەوەی کە پێشەوا لاوێکی عاقڵ و ژیر و زانستییە و هەق نییە خۆی بۆ بازرگانییەکلایی بکاتەوە، پێیان وتووە وەك ئەچیت بۆ دوکانەکەت دەی هەرواش بەشداری کۆڕی زاناکان بکە.

ئەگێڕنەوە پێشەوا وتوویەتی: ((جارێکیان دام بەلای ئیمام شەعەبیدا، دانیشتبوو، بانگی کردم و پێی وتم: بۆ کوێ ئەچیت؟ وتم: ئەڕۆم بۆ بازاڕ، وتی: مەبەستم بازاڕ نییە، مەبەستم کۆڕی زاناکانە؟ دەڵێ وتم: من زۆر کەم بەشداری وانەکانیان ئەکەم، ئەویش پێی وتم: بێئاگا مەبە، خەریکی زانست و زانیاری بە و لەگەڵ زاناکاندا دانیشە، چونکە من وتوو وریایی و بزێویەکت تێدا بەدی ئەکەم. دەڵێ: ئەو

وتانەی شەعەبی کاریان تێکردم و چوونە دڵمەوە، وازم لە بازاڕ و بازرگانی هێنا و دەستم کرد بە خوێندن، خودا سودی باشی لە وتەکانی شەعەبی پێ گەیاندم))[٥].

ئەم بەسەرهاتەش کۆمەڵێ مانا و ئاماژە لەخۆ دەگرێت:

یەکەم: پێشەوا لەسەرەتای ژیانییەوە بە کاڵای بازاڕ و بازرگانییەوە خەریك بووە، زۆر بەکەمی سەردانی کۆڕی زانایانی کردووە، لەسەرەتای ژیانیدا ویستی دواڕۆژ بازرگان دەربچێت، نەك زانایەك و خاوەنی مەزهەبێکی گەورە.

دووەم: وا دیاربووە پێشەوا نیشانەکانی زیرەکی و هەڵکەوتەیی و بەهێزی بیرکردنەوەی تێدا دیاربووە، چونکە ئەوەتا پێشەوا شەعەبی–هەست بەمە دەکات تیایدا و پێی وتووە بە ئاشکرا. بوونی ئەو هەمووە لایەن و دەستە سیاسی و بیروباوەڕانەی کە عێراق جمەی هاتووە لێی، ڕۆڵی خۆی بووە لە هەڵکەوتنی زۆریێ لە زاناکان. پێشەوایش لە سەرەتای ژیانییەوە ویستوویەتی لە ڕێگەی قسەکردن و میزگردەوە لە بازاڕ و شوێنە گشتییەکان، وەڵامی شایستەی ئەو کەسانە بداتەوە کە بە هەراو و ئارەزوو قسەیان کردوە لەبوارە جیاکاندا.

---

[٥] مناقب ابي حنيفە ،مەککی لا٥٩ بەرگی ١.

شەعەبیش(بە ڕەحمەت بێت)دەرکی بەمە کردووە و کە وادیار بووە ڕایەکانی لە ڕای ئەهلی سوننە و جەماعەوە نزیك بووە، ئەمە ئەوە دەرئەخات کە ئەو هەواڵانە ڕاستن کە پێشەوا لە سەرەتای ژیانی زانستییەوە بە زانستی کەلامەوە مەشغوڵ بووە.

سێیەم: پێشەوا ئەبوحەنیفەڕەحمەتی خوای لێ بێت لەسەر ڕۆشنایی ئامۆژگارییەکەی پێشەوا شەعەبی، خۆی بۆ زانست یەکلایی کردەوە، دوای ئەوە خۆی یەکلایی کردەوە بۆ وەرگرتنی زانست و زانیاری شەرعی و زۆر بەکەمی بەکاری بازرگانییەوە پەیوەندی مایەوە، کە ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ بەیەکجاری وازی لەکاری بازرگانی هێنابێت.

بەڵکو مێژوو ئەوەی دووپات کردۆتەوە کە تا دوا ساتی ژیانی دەستی لە بازرگانی هەڵنەگرت، هەر دووکانی قوماش فرۆشی هەبووە، دواتریش زیاتر پشتی بە هاوبەشەکەی بەستبوو لە بەردەوامی بازرگانیدا و بە ئەندازەی ئەوەی ئەوەندەی ژیانی ماددی مسۆگەر بکات، ئەمەش بۆ ئەوە باسمان کرد کە هەواڵەکان بە گشتی یەکن و هیچ دژایەتی یەك نییە لە نێوانیان.



## ئامۆژگاری شەعەبی بۆ پێشەوا:

دوای ئامۆژگاریەکەی شەعەبی، پێشەوا خۆی یەکلاکردەوە بۆ وەرگرتنی زانست، بەردەوام هاتووچۆی زاناکانی دەکرد. بەڵام کام لایەنی هەڵبژارد؟ کە لەو سەردەمەدا سێ جۆر هەڵقەی زانستی هەبووە:

یەکەم: ئەوانەی دەربارەی بنەماکانی بیروباوەڕ دەدوان و سەرجەم کۆمەڵ و دەستەکان قسەیان تێدا دەکرد.

دووەم: ئەوانەی بە زانستی فەرموودەوە خەریك بوون.

سێ یەم: ئەوانەی خۆیان زیاتر یەکلاکردبوویەوە بۆ دیراسەکردنی فیقهی، لەژێر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت داو فتوادان لە پێشهاتە نوێ یەکاندا.

*دەربارەی سەرەتای ژیانی زانستی پێشەوا ئەبوحەنیفە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) سێ ڕیوایەت هەیە کە یەکەمیان وا دیارە زانستەکانی هەڵسەنگاندنەوە و لە ئاکامدا ڕێگای فیقهی گرتۆتەبەر.

**ڕیوایەتی یەکەم:** ئەبوو یوسف لە پێشەواوە ئەگێڕێتەوە کە پرسیار کرا لە پێشەوا (ئەبوحەنیفە)کە چۆن ڕێڕەوی فیقهت هەڵبژارد؟

له وه‌ڵامدا وتی: بۆت باسه‌که‌م، سه‌ره‌تا دوای یارمه‌تی خوای په‌روه‌ردگار که زۆر سوپاس گوزارم بۆی. کاتێك ویستم بچمه نێو هه‌ڵقه‌ی زاناکانه‌وه هه‌موو زانسته‌کانم خسته پێش چاوم، هونه‌ر هونه‌ر لێیان کۆڵیمه‌وه و بیرم له ئاکامه‌که‌یان کرده‌وه و له‌گه‌ڵ سوده‌که‌یان.

سه‌ره‌تا وتم: زانستی-که‌لام- ئه‌خوێنم، پاشان سه‌یرم کرد، ده‌بینم ئاکامه‌که‌ی شتێکی خراپه و سودی زۆر که‌مه، ئه‌گه‌ر مرۆڤ زۆریش زیره‌ك بێت تیایدا هه‌ر ناتوانێ به ئاشکرا ڕایه‌کانی خۆی ده‌ربڕێت و توانجی تێ ده‌گرن و ده‌ڵێن: به هه‌واو ئاره‌زوو ده‌دوێت. پاشان سه‌یری زانستی ئه‌ده‌ب و زمانه‌وانیم کرد، سه‌یرم کرد ئاکامه‌که‌ی ئه‌وه‌یه تا مردن له‌گه‌ڵ منداڵاندا دانیشم و زمانه‌وانیان ڕاست که‌مه‌وه.

پاشان سه‌یری شیعرم کرد، ده‌ڵێم ئاکامه‌که‌ی سه‌رئه‌کێشێ بۆ پیاهه‌ڵدان و هه‌چووکردن و شه‌ڕه‌جنێو، به‌درۆ شت بڵێم و دین به‌رت به‌رت بکه‌م. پاشان سه‌یری زانستی قراءات ی قورئانیم کرد، وتم ئه‌وپه‌ڕی قووڵ بوومه‌وه تیایدا هه‌ر ده‌بێ له‌گه‌ڵ منداڵ و مێردمنداڵه‌کاندا بم و بۆم بخوێننه‌وه، قسه‌کردنیش له‌سه‌ر قورئان شتێکی سوك نییه و زۆر قورسه.

پاشان وتم فەرموودە ئەخوێنم، دەبینم فەرموودە زۆر زۆرن و تەمەنێکی زۆری ئەوێ تا هەمووی بەدەست دێنم و خەڵکی پێویستیان پێم دەبێت، ئەوکاتە مێرمنداڵەکان دێن بۆ لام و دەبێ بەردەوام لەگەڵ ئەواندا بم، لەوانەشە بە درۆزن و بێ مێشکم دابنێن تا مردن بەدوامەوە بن.

پاشان سەیری زانستی فیقهم کرد، هەر کە دیراسەم کرد گەورەییەکەییم بۆ دەرکەوت، هیچ عەیب و خەوشییەکم تیا نەبینی. لە بەرامبەردا بینیم کە لەگەڵ زانا و دانا و ڕووناك بیرەکاندا هەڵسوکەوت ئەکەم و لە ئەخلاقی ئەوان وەرئەگرم. هەروەك بینیم هەموو فەرزەکان و بەرپاکردنی دین و خواپەرستی دانامەزرێت بەبێ بوونی شارەزایی فیقهی، دونیا و ئاخیرەت بەوەوە بەندە.

هەرکەسێ بۆ دەست کەوتنی دونیا هەوڵی فیقهـ بدات دەستی دەکەوێت، هەر کەسێکیش بیەوێ لە ڕێگایەوە خۆی بۆ خواناسی و بەندایەتی تەرخان بکات، کەس ناتوانێ پێی بڵێ: لەخۆیەوە و بێ شارەزایی خواناسی دەکات، بەڕاستی هەر فیقهە کردەوە کردن بە زانستە.

**ڕیوایەتی دووەم:** یەحیای کوڕی شەیبان لە پێشەواوە دەگێڕێتەوە کە دەیوت: من پیاوێك بووم، توانای قسەکردنم زۆر باش

بوو، زەمەنێك چوومە ناویەوە و دەمەقاڵەم پێ دەكرد و بەرگریم پێ دەكرد.

ئەهلی كەلام و گفتووگۆیش زۆریان لە بەسرە بوون، منیش(٢٥) جار زیاتر سەردانی ئەوێم كردووە و جاری واهەبووە ساڵ و زیاتریش لەوێ ماومەتەوە، لەگەڵ (آباضیة) و(صفریە) كانی خەواریج كەوتوومەتە گفتووگۆ و ئەم زانستەشم بەباشترین زانست دادەنا و بە ئەسڵی دینم ئەزانی.

دوای تێپەڕ بوونی ماوەیەكی تەمەنم، بەخۆمدا هاتمەوە، وردبوومەوە و بەخۆمم وت: هاوەڵانی پێغەمبەرمان(صلی الله علیه وسلم) لە پێش ئێمەوە ژیاون دوای ئەوانیش تابعین، خەریكی ئەوە نەبوون كە ئێمە دەتمان داوەتێ لەكاتێكدا ئەوان بەتواناتربوون لەو مەسەلانەدا و زاناتربوون. هەموو ڕاستیەكانیان زانیوە كەچی دەمەقاڵە و گفتووگۆیان نەكردووە لەناو خۆیاندا، بەڵكو بێدەنگیان هەڵبژاردووە و ڕێگایشیان لێ كردووە.

لەبەرامبەردا بینیم لە شەرعزانی و و بەشەكانی فیقهدا كاریان كردووە، گفتووگۆیان كردووە و پێكەوە دانیشتوون و ئامادەی وتووێژەكانی بوون و خەڵكیشیان فێردەكرد و بانگیان دەكردن بۆ شارەزابوون و حەزیان تێدا دروست ئەكردن. فەتوایان ئەدا و فەتوایان وەردەگرت.

کاتێك ئەم شتانەم هەموو بۆ دەرکەوت، بەیەکجاری وازم هێنا لە زانستی دەمەقالە و مێزگرتی وشك و بێ گیان، بەوەندەی شارەزاییمان هەبێ تیایدا ڕازی بووین. گەڕاینەوە سەر ئەوەی سەلەف لەسەری بوون، ئەوەی ئەوان خەریکی بوون وەرمانگرت، دەستمان پێکرد لەوێوە کە ئەوان دەستیان پێکردووە، بۆ ئەو مەبەستە لەگەڵ زانایانی ئەو زانستەدا دانیشتین، بۆم دەرکەوت ئەوەی خەریکی هونەری دەمەقالە و چەلەحانی بێت، سیمایان لە سیمای پێشووەکان ناکات و بەرنامەشیان بەرنامەی پێشووەکان نییە، بینیم دڵیان ڕەقە و لەپێناو بردنەوەدا گوێ بە ئایەت و فەرموودە و سەلەفی سالح نادەن، هیچ لەخوا ترسان و خۆ لە گوناهـ پارێزی یەکیان تێدا نییە.

## ڕیوایەتی سێیەم:

لە قوتابییەکەیەوە کە ناوی (زوفەری کوڕی هوزەیل)، دەگێڕنەوە کە دەیوت:

لە ئەبوحەنیفەم بیست ئەیوت: لە نزیك هەڵقە فیقهیەکەی (حەمادی کوڕی ئەبی سولەیمان)وە هەڵقەمان بەستبوو لە زانستی کەلام و گفتووگۆدا و قسەمان دەکرد، من زۆر قووڵ بووبوومەوە تیایدا تا وام لێهاتبوو خەڵکی ئاماژەیان بۆ دەکردم، جارێك ژنێك هات بۆ لام و پرسیاری لێکردم و وتی: پیاوێك ژنەکەی کەنیزەکە؛

ئەیەوێت لەسەر شێوازی سوننەت لێی جیابێتەوە، چەند تەڵاقی بدات؟

منیش پێم وت:ئەوە حەمادە و برۆ پرسیار لەو بکە، پاشان وەڵامەکەشیم بۆ بهێنەوە.

ئەویش چوو پرسیارەکەی لە حەماد کرد و ئەویش وتی: لەکاتی پاکێتیدا یەك تەڵاقی بدات، پاشان وازی لێبهێنێت تا دەکەوێتە بێ نوێژییەوە و کە پاك بوویەوە و خۆی شت، بۆی هەیە شوو بکاتەوە، ئافرەتەکە کە گەڕایەوە و پێی وتم.

لەو ساتەوە وازم هێنا لە زانستی دەمەقاڵە و(کەلام)و قسەکردن لە مەسەلە بیروباوەڕییەکان و نەعلەکانم لەپێ کرد و چوومە هەڵقەکەی حەممادر، هەموو قسەکانیم لەبەر ئەکرد و لەڕۆژی داهاتوودا هەمووریم بە لەبەر دەوتەوە، لەبەرم دەکرد بەڵام قوتابییەکانی هاوڕێم هەڵەیان ئەکرد تا وام لێهات(حەماد)وتی: ((جگە لە(ئەبوحەنیفە)کەس لە تەنیشتما دانەنیشێت)).

هەر سێ ڕیوایەتەکەی دژی یەکتر نین بەڵکو تەواوکەری یەکن، دیارە لەسەرەتاوە زانستەکانی تر فێربووە و چاو و عەقڵی زیاتر کرایەوە بۆ پێشەوایەتی کردنی فیقھ و دانانی بناغەی مەزھەبێکی تایبەت بەخۆی، کە دواتر ملیۆنەها کەسی ئەهلی سوننە شوێنی کەوتن.

* کەواتە پێشەوا ئەبوحەنیفە (ڕەحمەتی خوای لێبێت) بە هەموو ڕۆشنبیرییە ئیسلامییەکانی ئەو سەردەمە خۆی ڕازاندەوە، لەسەر شێوازی(عاصم)قورئانی لەبەرکرد.

ئاستێکی باش فەرموودەی وەرگرت، برێك لە ئەدەب و زمانەوانی و شیعری وەرگرت، لە مەسەلە بیروباوەڕیەکانیشدا گفتوگۆی لەگەڵ دەستە وتاقمەکاندا کردبوو، تا وای لێ هاتبوو بەساڵ لەماڵ دوور ئەکەوتەوە و دەچوو بۆ شاری بەسرە و بیری خەواریجەکانی ڕاست ئەکردەوە، بەڵام دواتر، لەئاکامدا ئاوڕی دایەوە بۆ زانستی فیقهی ئیسلامی.

دەمەقاڵە و قسەکردن لە مەسەلە بیروباوەڕیەکاندا حەز و خولیای بووە لە سەرەتای ژیانییەوە، لەو بوارەشدا زۆر شارەزا بوو بوو، تەنانەت دوای ئەوەشی کە ئاوڕی دایەوە بۆ زانستی فیقهی، هەر لەکاتی پێویستدا بەردەوام بووە لەسەر قسە و گفتوگۆ، بەتایبەت کە خەواریجەکان ئەهاتنە هەڵقە زانستییەکانی و لەو بارانەوە پرسیاریان لێ ئەکرد[٦].

گفتووگۆی کردووە لەگەڵ ڕۆچووەکانی شیعە و توانیویەتی قەناعەتیان پێ بکات، ئەمە لە وەختێکدا بووە کە خۆی بۆ زانستە

---

[٦] لێیەوە سابت بووە کە لەدوای ئەوەی دەستی دایە زانستی فیقهیش هەر لە کاتە پێویستەکاندا گفتووگۆ و بەپێویستی زانیوە فیکری خەواریجەکان بگۆڕێت...

فیقهییەکان یەکلاییش کردبوویەوە هەرچەندە نەیئەهێشت قوتابی و هاوڕێکانی بچنە ناو ئەو دەمەقاڵە و گفتووگۆیانەوە، تەنانەت کاتێ حەمادی کوڕی خەریکی گفتووگۆ و دەمەقاڵە بوو لە زانستی کەلامدا، بەتوندی بەرگری لێ کرد.

ئەویش وتی: باوکە گیان تۆ خۆت ئەیکەیت کەچی نایەڵی ئێمە دەمەقاڵە و گفتووگۆ بکەین، ئەویش ئەیفەرموو: ((بەڵێ ئێمە گفتووگۆ و دەمەقاڵەمان کردووە و ئەوەندە بێ دەنگ دەبووین دەتوت باڵندە بەسەرما نەوەیە، لەترسی ئەوەی نەبادا هاوڕێکەمان تێبکەوێت و هەڵخلیسکێت، بەڵام ئێوە کە گفتووگۆ دەکەن و بەڵام دەتانەوێ هاوڕێکەتان هەڵخلیسکێت، هەرکەسیش بیەوێ هاوڕێکەی هەڵخلیسکێت، ئەوە دەیەوێت هاوڕێکەی بێ باوەڕ بێت، ئەوەشی حەز بکات هاوڕێکەی بێ باوەڕ ببێت،ئەوە خۆی کافر بووە پێش ئەوەی هاوڕێکەی بێ باوەڕ ببێت))[٧].

جارێکیان وەفدێکیان هاتن بۆ لای کەئەیان وت ئەوەی گوناهی گەورە بکات بێ باوەڕ دەبێت.

بە پێشەوایان وت: لەبەر دەرگای مزگەوت دوو جەنازە دانرابێ، یەکەم پیاوێکە ئەوەندە مەی خواردۆتەوە تەقاندوویەتی و مردووە،

---

[٧] مناقب ابرحنيفه لابن بزازى ص١٢١ ج١.

دووەمیش ژنێکە زینای کردووە و سکی هەیە و خۆی کوشتووە، تۆ چی دەڵێی دەربارەیان.

پرسی لێیان: ئایا جولەکەن؟ وتیان: نەخێر، وتی: ئەی گاورن؟ وتیان نەخێر، وتی: مەجوسن؟ وتیان نەخێر، فەرمووی: ئەی لەسەر کام ئاینن؟ وتیان موسوڵمانن و لەسەر وشەی شەهادەن پێی وتن: پێم بڵێن ئایا شایەتوومان سێ یەك یان چوار یەك یان پێنج یەکی باوەڕە؟ وتیان: ئیمان ناکرێ بەسێ یەك و چارەك و پێنج یەکەوە وتی: دەی چەندێ لە ئیمان؟

وتیان: هەموو ئیمانەکەی، وتی: دەی ئیتر بۆ پرسیارم لێ دەکەن سەبارەت بە خەڵکێك کە دانتان پێدا نا باوەڕدارن وتیان: دەی باشە واز لەمەش بێنە، ئایا بەهەشتین یان دۆزەخین؟ کە مادەم دانتان بەوەدا نا، منیش هەر ئەوە دەڵێم کە ئیبراهیم پێغەمبەر (علیه السلام) بە گەلەکەی فەرموو کە گوناهیان زۆر گەورەتر بوو لە هی ئەم دووانە: ﴿ فَمَن تَبِعَنِي فَإِنَّهُۥ مِنِّي ۖ وَمَنْ عَصَانِي فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ۝٣٦ ﴾ ابراهیم:٣٦.

واتە: هەر کەس شوێنم بکەوێت و باوەڕبێنێت ئەوە لە منە و هەرکەسیش سەرپێچی کردم ئەوە تۆ لێبووردە و لێخۆشبوویت.

یان ئەوەی عیسی (علیه السلام) بە گەلەکەی وت: ﴿ إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ ۖ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١١٨﴾ ﴾ المائده: ١١٨.

واتە: ئەگەر سزایان بدەیت ئەوە بەندەی خۆتانە و ئەگەر لێشیان خۆشبیت ئەوە تۆ خۆت زاڵ و کار دروستیت. کاتێ خەواریجەکان ئەم ڕاستیەیان زانی چەکیان دانا)).

***

## مامۆستاکەی پێشەوا ئەبوحەنیفە

پێشەوا بەردەوام لە خزمەت حەمادی کوڕی سولەیماندا وانەی فیقهی دەخوێند و بەردەوام زانستی لێ وەردەگرت تا کۆچی دوایی کرد.

دەبێ پێشەوا لە چەند ساڵێدا چووە خزمەت مامۆستاکەی دەستی کرد بە خوێندنی زانستی فیقهی ئیسلامی. ئەی دەبێ لە ساڵی چەندا بە سەربەخۆ خۆی بوو بە مامۆستا و سەرچاوەی زانست. ئەی دەبێ تەنها لە مامۆستا حماد سوودی وەرگرتبێت، ئایا مامۆستای تری نەبووە؟

ئێمە ناتوانین ئەو ساڵە دیاری بکەین کە بوو بەقوتابی حەماد و هەموو مێژوونووسان لەسەر ئەوەن کە لە خزمەت حەمادا بووە تا کۆچی دوایی دەکات، بەسەربەخۆیی وانەی نەوتۆتەوە بەڵکو لەدوای مردنی حەماد. شوێنەکەی بۆش بوو بوو، پێشەوا لەدوای(١٨) ساڵ خوێندن لەبەردەستی مامۆستاکەیدا، وا ئەمڕۆ ناچارە بچێتە شوێنی مامۆستاکەی. حەماد لە ساڵی(١٢٠) ی کۆچیدا لە دونیا دەرچوو، و لەو کاتەدا ئەبوحەنیفە تەمەنی(٤٠) ساڵ بوو. واتە ماوەی(١٨) ساڵ لە حزوری مامۆستاکەیدا بووە، ئەمەش ئەوە دەرئەخات کە تەمەنی(٢٢) ساڵ بووە.

پێشەوا دەڵێ چووم بۆ بەسرە و وام گومان دەبرد کە ئیتر وەڵامی هەموو پرسیارە فیقهییەکان دەزانم، بەڵام هەندێ پرسیاریان ئاڕاستەکردم، وەڵامەکانیانم نەدەزانی، بۆیە بڕیارم دا تا مامۆستاکەم بەسەر زیندوو بێت من قوتابی بەردەستی بم[8].

زوفەر ئەگێڕێتەوە لە پێشەواوە کە وتوویەتی: ((هاوڕێیەتی حەمادم کرد بۆ ماوەی(٢٠) ساڵ و لەپاش ئەو ماوەیە حەزێکی سەرکردەیی و پێشەوایی سەری لێدام، ویستم واز لە هەڵقەکانی بێنم و خۆم سەربەخۆ هەڵقەیەك دامەزرێنم، بۆیە کاتی عیشایەك ویستم حەزەکەم جێبەجێ بکەم، کاتێ چوومە مزگەوت هەرچیم کرد نەمتوانی لێی جیاببمەوە و چوومەوە ناو هەڵقەکەی مامۆستا حەماد ))[9].

هەر لەو شەوەدا خزمێکی لە بەسرە کۆچی دوایی کرد و ڕۆشت بۆ بەسرە و بەمنی وت لەجیاتی من هەڵقەکە بەڕێوەبەرەوە و وەڵامی خەڵکی بدەرەوە، ئەوەبوو کۆمەڵێ پرسیاریان لێکردم کە تا ئەو کاتە نەمبیستبوو، منیش وەڵامی هەر(٦٠) پرسیارەکەم دایەوە و وەڵامەکانیشم لای خۆم نووسی، کە مامۆستا گەڕایەوە پرسیارەکان و وەڵامەکانیشم خستە بەردەستی، ئەویش(٤٠) وەڵامیانی بە دڵ

---

[8] تاریخ بغداد بەرگی ١٣ لا٣٣٣.

[9] هەمان سەرچاوە.

بوو،(٢٠) وەڵامیشی پێ ڕاست نەبوو، بۆیە سوێندم خوارد لێی دوور نەکەومەوە تا یان من دەمرم یان ئەو دەمرێت و تا دونیای بەجێ هێشت لە خزمەتیدا بووم[10].

ئەی ئایا بە تەنها حەماد مامۆستای بووە؟ کاتێ لە ژیانی پێشەوا دەکۆڵینەوە بۆمان دەردەکەوێت کە لە وەرزی حەجدا لە مەککەی پیرۆز، چاوی کەوتووە زاناکان بە تایبەت (تابعین) ئەوانەی کە زانستیان لە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) وەرگرتبوو، بەڵام تەنها دیداری زانستی و ڕاگۆڕینەوە و فەرموودە گێڕانەوە بوو و تاوتوێ کردنی مەسەلە فیقهییەکان و ئەوانەش کە گفتوگۆی لەگەڵ دەکردن لە هەموو چین و تاقم و دەستەکان، لەگەڵ هەردوو زانای مەزهەبی شیعە زیدی کوڕی علی(زین العابدین)و(جعفر الصادق)دا دیراسە و تاوتوێی فیقهی و زانستی کردوە.

هەروەك لەگەڵ زانا عبداللەی کوڕی حەسەن (النفس الزکیە) و لەگەڵ هەندێ (کیسانی)یەکانیشدا دانیشتووە کە باوەڕیان بە(رجعە)هەبووە کە دواتر بە درێژی باسی لێوە دەکەین.

****

---

[10] هەمان سەرچاوە.

## پێشەوا چووە جێگای مامۆستاکەی

پێشەوا ئەبوحەنیفە ڕەحمەتی خوای لێ بێت دوای کۆچی دوایی مامۆستاکەی، ئەو یەکەمین هەڵبژێردراو بوو بۆ جێگرتنەوەی مامۆستاکەی لە مزگەوتی گەورەی کوفە. بەردەوام وانەی بە قوتابییەکانی دەوتەوە و لە مەسەلە فیقهی و فەتواییانەی دەهاتنە پێش، قیاسی ئەو شتانەی دەکرد کە هاوشێوەی یەك بوون، بە عەقڵ و ژیریەکی ڕێك و پێکەوە کە دواتر ڕێبازەکەی ئەو مەزهەبە فیقهییەی لێ دروست بوو پێی دەڵێن (مذهب الحنیفە)، لێرەدا باسی ڕوداوەکانی ژیانی و ئەوەی پەیوەندی پێوە هەیە دەکەین، واتە باسی کەسایەتی خۆی ئەکەین، کەچی بووە هۆی دروست بوونی وەك زانایەك، پاشان باس خودی خۆشی دەکەین، کە دارێکی زانستی وای چاند بۆ نەوەکانی داهاتووە کە لە سەرجەم شارە گەورەکانی ئەو کاتەدا، چاوی خەڵکی کردەوە بۆ قسەکردن لەبارەی دەرهێنانی فەرمودە و زانستی فیقهـ.

دەبێت لێرەدا لە دوو شت بدوێین کە پەیوەندی بە ژیانی کەسێتی پێشەواوە هەیە.

یەکەم: ژیانی چۆن بووە؟ بەچی ژیاوە؟

دووەم: لەسەر ڕوداوەکانی سەردەمەکەی هەڵوێستی چۆن بووە و ئایا ئاستی کاریگەری لەسەر ژیانی تا چ ئەندازەیەك بووە؟

پێشتر باسمان کرد کە لە مێژووەکەیەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە پێشەوا لە ماڵێکی دەوڵەمەندا گەورە بووە، کە باوکی و باپیریشی بازرگان بوون، دیارە بازرگانیش بە ئاوریشمەوە خێر و قازانجێکی زۆری هەیە بۆ خاوەنەکەی. پێشەوایش لەوانەوە هەمان کار و کاسپی هەڵبژارد، سەرەتای ژیانی خەریکی کاری بازاڕ بووە، بەشداری کۆڕی زانایانی کردووە، تا ئەوە بوو(شەعبی)داوای لێکرد بچێتە کۆڕ و هەڵقەی زانایانەوە، لەوکاتەوە دەستی کردووە بە هاتووچۆی هەڵقەی زانستە فیقهییەکان.

بەڵام ئایا وازی لە بازرگانی و بازاڕ هێنا بە یەکجاری؟ هەموو گێڕەرەوەکان لەسەر ئەوەن کە وازی لە بازرگانی نەهێناوە[11].

دەڵێن ڕۆژی شەممان وانەی نەوتۆتەوە و نەشچووە بۆ دوکان بەڵکو خۆی بۆ ئیش و کاری ماڵەوە تەرخان دەکرد.

هەموو ڕۆژێك لە چێشتەنگاوە تا دوای نیوەڕۆ دوکانداری دەکرد، هەموو ڕۆژێکی هەینیش هاوڕێکانی دەعوەت دەکرد بۆ ماڵەکەی خۆی هەموو چێشتێکی خۆشی بۆ لێدەنان[12].

---

[11] المناقب للمکی بەرگی ٢ لا١٩٦.

[12] الخیرات الحسان لا٤٤.

دەڵێن لە دوکانەکەیدا شەریکی هەبووە و بەو هۆیەوە توانیویەتی بەردەوامی بدات بە خوێندن و دواتریش بە وانەوتنەوە و خزمەت کردنی زانستی فیقهی و گێڕانەوەی فەرموودە.

و زۆرێ لە زانایان هەروابوون.هەردوکیان پێکەوە گرێداوە-زانست و بازرگانی-لەوانە(عگای کوڕی واصل)کە هاوتەمەنی پێشەوا بووە لەگەڵ زاوایەکیدا پێکەوە دوکانداری کردووە.

* * *

## پێشەوا نموونەی بازرگانی دەست پاك

پێشەوا (بەڕەحمەت بێت) چوار سیفەتی تێدابوو کە پەیوەندی بە ژیان و هەڵسوکەوتی لەگەڵ خەڵکی لەکاری بازرگانییەکەیدا. کە بوو بوو بە نموونەی بازرگانی ڕێك و ڕاست و دەستپاك، هەروەك چۆن لە زانست و زانیاریشدا لە چڵەپۆپەی زانایاندا بووە:

یەکەم: کەسێکی چاوچنۆك و تەماح باز نەبووە و دڵی دەوڵەمەند بووە، ئەمەش لەوانەیە لەبەر ئەوە بووبێت کە لە خانەوادەیەکی دەوڵەمەندا ژیاوە و هەرگیز موحتاجی نەبینیوە.

دووەم: زۆر دەست پاك بووە، زۆر خۆی لە حەرام خواردن پاراستووە.

سێیەم: زۆر هەرزانجان و لێبوردە بووە و خوا لە ڕەزیلی پاراستوویەتی.

چوارەم: زۆر دیندار و خواناس بووە، عیبادەتی زۆری هەبووە بە ڕۆژ بە ڕۆژوو بووە و بە شەویش شەونوێژی کردووە.

ئەم چوار ڕەوشتەش وای لێ کردووە کە کاریگەری گەورەی هەبووە لەسەر ژیانی بازرگانییەکەی، تا وای لێهاتبوو لەناو بازرگانەکاندا نامۆ دیاربوو.

زۆر کەس بە ئەبوبەکری صدیقی ئەچوێنن، لەسەر پرۆگرامی ئەو هەنگاوی دەنا، چاری لەو ئەکرد، بەڕاستی شوێن کەوتەیەکی سەلەف

بووه، تەنانەت لەشت کڕینیشدا وەك فرۆشتن هەر ئەمین و دەستپاکانە دەیکرِی.

ژنێك هات بۆ دوکان بۆ لای قوماشێکی ئاوریشمی پیّ دا تا بۆی بفرۆشێت، لێی پرسی: بەچەندی ئەدەیت؟ ژنەکەش وتی: بە صەد درهەم، پێشەوا وتی: خوشکم قوماشەکەت زیاتر دەکات چەندت تری بۆ زیاد دەکەیت؟ ژنەکەش وتی: دوو سەد، پێشەوا وتی: نا هەر زیاتر دەکات. دەیکات بە سیّ سەد، پێشەوا هەر دەڵیّ: نا زیاتر دەکات، ژنەکەش دەیکات بە چوار سەد، پێشەوایش وتی: هەر زیاتر دەکات!، ژنەکەش تێك چوو هاواری کرد وتی: گاڵتەم پیّ دەکەیت قوربان؟ وتی: ئێستا کەسێك بانگ ئەکەم لێت بکرِێت. کەسێکی بانگ کرد و ئەویش هات و وتی: بە پێنج سەد ئەمەوێت[13].

ئەبینی چۆن بازرگانێکە –خەمی گیرفانی خۆی نییە–، بەڵکو خەمی موشتەرییەکانیشی هەیە و بیّ ئاگایی و نەزانینی نرخەکەی بەهەل نازانێت و بۆ سوودی خۆی بەکاری بێنێت، بەڵکو لەم کاتەشدا هەر وەك ئامۆژگارێکی دڵسۆز و غەمخۆر نرخە ڕاستەقینەکەی پیّ دەڵێت.

---

[13] تأريخ بغداد بەرگی ١٢ لاپەڕە ٣٦.

پێشەوا دەستی لە قازانج هەڵئەگرت و بە مایەکەی خۆی ئەیفرۆشت ئەگەر بیزانیایە هەژار و دەست کورتە یان خزم و هاوڕێیەتی، یان قازانجەکەی ئەکرد بە دوو بەشەوە لەگەڵیدا.

جارێکیان ژنێك هات بۆ دوکان بۆلای پێشەوا و پێی وت: زۆر دەست کورتم، بەڵکو ئەو قوماشەم بە مایەکەی خۆی پێ بدەیت. پێشەوا پێی وت: بیبە بە چوار دەرهەم. ژنەکەش وتی: گاڵتەم پێ ئەکەی من پیرێژنێکم و پێشەوا وتی: نەخێر بەڕاستمە من دوو قوماش بوو بە(٤٠٤) کڕیمن، و یەکێکیانم دا بە چوار سەد و ئەمەیان کەوتۆتە(٤) دەرهەم[١٤].

جارێکی تر هاوڕێیەکی پێشەوا (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دێت بۆ دوکان و پێی دەڵێ: ئاوریشمێکم دەوێت زۆر جوان و زۆر چاك و بە مایەکەی خۆشی بمدەیتێ. پێشەوا بە سنگێکی فراوانەوە دەڵێ بەسەرچاو بەس سەبرم لێ بکە با پەیدای بکەم بۆت. هەفتەیەك تێنەپەڕی و پێشەوا پەیدای کرد، و کە هاوڕێکەی تێپەڕی بانگی کرد و وتی پێی: بۆم پەیدا کردی، وتی: زۆرباشە بە چەند؟

پێشەوا وتی: یەك درهەم. هاوڕێکەی وتی: هەرگیز گومانم نەبردووە کە تۆ گاڵتەم پێ بکەیت. پێشەوایش وتی: گاڵتەم نەکردووە بەڵکو دوو قوماشم پێکەوە کڕی بە(٢١) درهەم و

---

[١٤] تاریخ بغداد بەرگی ١٣ لاپەڕە ٥٨.(٢) تاریخ بغداد بەرگی ١٣ لاپەڕە ٣٦٠.

یەکەمیانم داوە بە(٢٠) درهەم و ئەمەشیان یەك درهەم کەوتووە لەسەر من.

گومانی تێدا نییە ئەم جۆرە بازرگانییەی پێشەوامان لە بەخشین دەکات، تەنها بەرگی کڕین و فرۆشتنی لەخۆگرتووە و بازرگانی نییە، بەڵکو نیشانە و ئەمارەتی دەستپاکی و سەماحەت و لێبوردەیی و بە بەزەیی بازرگانێکی مەزن دەگەیەنێت کە لە خواترسان و کارکردن بۆ قیامەت نە تەنها بۆ قازانجی دونیایی ئاواتییەتی.

پێشەوا ئەبوحەنیفە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) زۆر خۆی بە دوور گرتووە لەهەر شتێك بەحاڵ بۆنی حەرامی لێ هاتبێت، ئەگەر زۆر بە کەمیش بووبێت، ئەگەر گومانی لە پارەیەك پەیدا بکردایە یەکسەر دەری ئەهێنا و بەسەر هەژاراندا دابەشی دەکرد.

ئەگێڕنەوە جارێکیان قوماشێکی دا بە شەریکەکەی و پێی وت بیفرۆشە بەڵام عەیبێکی تێدایە، کڕیاری لێ ئاگادار بکە، حەفصی کوڕی عبدالرحمن، قوماشەکەی فرۆشت بەڵام بیری چوو عەیبەکەی پێ بڵێ کە پێشەوا گەڕایەوە و زانی قوماشەکە فرۆشراوە وتی عەیبەکەت پێ وت؟حەفص وتی: نەخێر بیرم نەبوو،زۆر هەوڵی دا کڕیارەکەی نەدۆزیەوە بەناچاری پارەی هەموو قوماشەکەی کرد بەخێر[١٥].

---

[١٥] الخيرات الحسان لا ٦١.

ئەم خۆپارێزی و ڕازی بوون بە پارەی حەڵاڵە وای کرد لە پێشەوا کە بەرەکەت بکەوێتە بازرگانیەکەی و قازانجی زۆر دەست دەکەوت، هەموو پارەکانیشی دابەش دەکرد بەسەر زانایان و فەرمووده گێڕەرەوەکاندا و لە کتێبی(تاریخ بغداد)دا هاتووه دەڵێ:

(( قازانجی ساڵێکی کۆدەکردەوە و بەو پارانە پێداویستی مامۆستا و خوێندکارەکانی زانستی فیقهـ و فەرموودەی دەردەکرد، هەر لە خواردن،و جل و بەرگ و هەموو پێداویستیەکانی تر، چ پارەشی بمایەتەوە دابەشی دەکرد بەسەریاندا و پێی دەوتن: ها خەرجی کەن بۆ خۆتان و تەنها سوپاسی خوای لەسەر بکەن چونکە پارەی من نییە ئەوە بەخشندەیی خودایە بەسەر منەوە بۆ ئێوە))[16].

ئیتر پێشەوا هەر قازانجێکی بکردایە بۆ پارێزگاری کەرامەتی زاناکان و تەواوکردنی پێداویستی یەکانیان ی سەرف دەکردەوە و نەیدەهێشت زاناکان داوای هاوکاری لەکەس بکەن. جل و بەرگی هەمیشە جوان و کەشخە و گرانبەهابووە، کاتێك دەڵێن دەستێ جلی کردووە بە(۳۰) دینار[17].

---

[16] تاریخ بغداد ب ۳ لا ۲٦۳.

[17] زیاتر لە ۳۰۰ هەزاری پارەی عیراقی دەکات..(وەرگێڕ)

زۆر خۆی جوان کردووه و هەمیشه بۆنی خۆشی لەخۆی دەدا (ابو یوسف) دەڵێت: ((هەمیشه ئاگای له نەعلەکانی بوو،هەرگیز به نەعلی پچڕاوەوه نەبینراوه(١) که قۆنەره کۆنەکەی ئەمڕۆ دەکات.))

تەنانەت گرنگی به ڕێك و پێکی و جوانی جل و بەرگی هاوڕێکانیشی داوه، ڕۆژێك پیاوێکی بینی له کۆڕێکیدا که پێکەوه دانیشتبوون، دەبینێ جلەکانی زۆر شڕه و کۆن و دڕاون.

بەنهێنی پێی وت دوایی تۆ مەچۆ کارم پێته. که ئەو ناوه چۆڵ بوو پێی وت: بڕۆ لەژێر ئەو بەرماڵەدا چی تێدایه بیبه بۆ خۆت. پیاوەکەش بەرماڵەکەی هەڵدایەوه بینی(١٠٠٠) درهەمی تێدایه، وتی: بیبه بۆ خۆت و بیده به جل و بەرگی جوان و خۆتی پێ کەشخه و جوان بکه.

پیاوەکەش وتی: من وەزعم باشه و لەناو نازو نیعمەتدام و پێویستم بەپاره نییه. پێشەوایش پێی وت: ئەی ئەو فەرموودەیەت نەبیستووه که پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)فەرموویەتی: (أنّ الله يحب أن يري أثرَ نعمَته عَلي عَبده)؟واته: خوا پێی خۆشه ئاسەواری بەخششەکانی به بەندەکەیەوه ببینێ، ده بڕۆ خۆت جوان بکه و جل و بەرگی جوان بکڕه و لەبەری بکه با هاوڕێکانت خەفەتت بۆ نەخۆن.

***

## تێڕوانینی سیاسیانەی پێشەوا

هەڵوێستی پێشەوا ئەبوحەنیفە لەمەڕ ڕووداو و پێشهاتە سیاسیەکانی هەردوو سەردەمی ئەمەویەکان و عەباسیەکان و هەڵوێستی لە شۆڕشەکانی عەلەویەکان، دژ بووە بە ستەمی ئەو حکومەتانەی ئەو سەردەمە.

تەنانەت لەو پێناوەشدا بوو گیانی بەخت کرد و لەژیاندا دووچاری زیندان و ئێش و ئازار و سزادان بووە، چونکە پێشەوا (٥٢) ساڵی ژیانی لە سەردەمی ئەمەویەکاندا بەسەربردووە و(١٨) ساڵی تەمەنیشی لەسەردەمی عەباسی یەکاندا ژیاوە.

ئەمەویەکانی بینی لە ئەوجی هێز و دەسەڵات و هەژموونداببوون و پاشان وورده وورده بەرەو کەوتن و لەناوچوون ڕۆشتن. پاش ئەوانیش عەباسییەکانی بینی کە ژێر بەژێر لەلایەن فارسەکانەوە برەوی پێ دەدرێت و دواتر بینی ئەمانە بۆ ڕووخان و دژایەتی ئەمەویەکان دروست بوون و لەلایەن خزمە زۆر نزیکەکانی پێغەمبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) سەرۆکایەتی دەکرێت و دەیانەوێت لەڕێگای هێز و ترس و تۆقاندنەوە لە دەسەڵات بمێننەوە.

پێشەوا دەرکی بە هەموو ئەمانە دەکرد، هەرچەندە هەرگیز لەگەڵ دەرچووان و شۆڕشگێڕاندا نەبینراوە دژیان، هەرچەندە ئاماژەکان بۆ ئەوە دەچن کە لەگەڵ عەلەویەکاندا بووە دژ بە خەلیفە

و والییه ستەم کارەکان، ئیتر چ لەکاتی ڕووخانی ئەمەویەکاندا بوو‌بێت یان لە شۆڕش دژی عەباسی یەکان.

ئەو دەیوت/ (بەنی ئومەییە) هیچ مافێکی مانەوەیان نییە لە دەسەڵات دا بەپێی شەرع یان ئایین. بەڵام هەرگیز نەیکردووە بە شمشێردا و شۆڕشی بەرپا نەکردووە، هەرچەندە نیازی کردووە شتی واش بکات بەڵام لەبەر هۆکار گەلێك دەستی لێ هەڵگرتووە.

ئەگێڕنەوە کە(زید)ی کوڕی(علی)کە بە زین العابدین ناوبانگی دەرکردبوو، لەساڵی ١٢١ ی کۆچیدا دژی دەسەڵاتی هشام ی کوڕی عبدالملك هەستا و دەستی دایە چەك دژیان.

پێشەوا زۆری پێ خۆش دەبێت و تەنانەت دەڵێ: ((من دەرچوونی دژی هشام وەك دەرچوونی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە ڕۆژی بەدردا دەبینم))، پێیان وت: دەی کەواتە بۆچی خۆتت نەگەیاندە سوپاکەی؟ وتی: ئەمانەتی زۆری خەڵکم لابوو نەمتوانی بڕۆم، هەرچەندە داوام کرد لە (ابن ابی لیلی)کە ئەمانەتەکان بگرێتە ئەستۆ و بیانگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکانیان بەڵام ئەو قبوڵی نەکرد، منیش ترسام بمرم و ئەو ڕاسپاردانە وون ببن.

هەروەها لە جێیەکی تردا بیانوویەکی تر دێنێتەوە و دەڵێ: ((ئەگەر ئەمزانی خەڵکی پشتی بەرنادەن وەك چۆن کاتی خۆی پشتی باوکیان بەردا لەگەڵیدا جیهادم دەکرد چونکە پێشەوایەکە بە

حەق، بەڵام بە پارە و سامانم پشتگیری دەکەم)) دە هەزار دەرهەمی بۆ نارد و بە نێردراوەکەشی وت: پێی بڵێ مەعزەرەتم قبوڵ بکات[١٨].

ئەم دوو هەواڵە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە پێشەوا ڕای وابووە دروستە شۆڕش بەرپاکردن دژی ئەمەویەکان بەپێی بەڵگە شەرعییەکان، ئەگەر بێت و پێشەواکەش کەسێکی دادپەروەری وەك زەیدی کوڕی عەلی(خوا لێی ڕازی بێت)، ئەو خۆشی ئاواتە خوازبووە لەگەڵ جەنگاوەرەکاندا بەشداری بکردایە بە شمشێر.

هەرچەندە باوەڕی بە سەرەنجامەکانی نەبووە، بەڵام ئەیزانی کارێکی حەق و ڕەوایە، بەڵام ناگەنە ئاکام چونکە پشتگیر و لایەنگری تەواوی نییە، لەگەڵ ئەوەشدا نەیویستووە بچێتە ڕیزی سەرکز و دانیشتووەکان بۆیە بە ناردنی کۆمەکی دارایی پشتگیری خۆی دەربڕیوە بۆیان و کۆمەکی داراییش کەم نییە بۆ شۆڕشەکان.

ئیتر لەگەڵ ئەوانەشدا نین کە هەندێ بیانووی دەرنەچوونی لەگەڵ شۆڕشگێڕەکان ئەگێڕنەوە بۆ ئەوەی کە شمشێربازی نەزانیوە و پیاوی مەیدانی خەباتی چەکداری نەبووە. خۆ ئەگەر وابوایە پێشەوا شەرمی نەدەکرد و ڕاستەوخۆ دەیوت من هونەری جەنگی نازانم و زانست پیشەم بووە، نەخێر دوو ڕوویی لەم کەسایەتییە مەزنەدا نەبووە. تا شتێك بە دەم بڵێت و لە دڵیشەوە شتێکی تر، چونکە

[١٨] المناقب–ابن جوزی ب١ لا ٥٥.

خاوەنی غیرەت و ئازایەتی و هەرگیز ترسنۆکی و سەرشۆڕی نەزانیوە مانای چییە.

## ئاکامی شۆڕشەکان

شوشەکەی زەید لەساڵی ١٣٢ ی کۆچیدا بە شەهیدکردنی خۆی کوژایەوە.

پاشان کوڕەکەی لە خوراسان کە ناوی-یەحیا-بوو شۆڕشی هەڵگیرساند بەڵام وەك باوکی شەهید کرا و عبداللەی کوڕی یەحیاش دووبارە لە یەمەن دەستی دایەوە چەك و شۆڕشی بەرپاکرد، بەڵام بەدەستی سوپای دواین خەلیفەی ئەمەویەکان ئەویش لەناوبرا وەك باوباپیرانی[١٩].

زەید و شۆڕشەکەی پایەیەکی گەورەی هەبوو لە دڵی پێشەوا (ئەبوحەنیفەدا) وەك باسمان کرد دەرچوونەکەی چواند بە دەرچوونی پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)بۆ جەنگی بەدر.

هەروەك زۆر بەڕێز و حورمەت بوو لەلای، بە زانست و ڕەوشت و ئاینداریەکەی سەرسام بوو، بە کێ لە پێشەوا حەق و ڕەواکان بۆی

---

[١٩] الکامل-ابن اثیر ب٥ ل١٣٠،٥،١٢٢

ئەڕوانی، بە پارە و سامان پشتگیری دەکرد تا لەو کەسانە هەژمار نەکرێت کە تەمەڵی دەکەن لە جیهاد و شۆڕش دژی ستەم.

پێشەوا بە چاوی خۆی شەهیدکردنی ئەم سەرکردە حەق و ڕەوایانەی بەچاوی خۆی بینی بەدەستی ئەمەویەکان، بۆیە لە وتار و وانەکانیدا ئەم ستەمکاریانەی نەدەشاردەوە و باسی زوڵمی ئەمەویەکانی دەکرد.

تا ئەوە بوو یەزیدی کوڕی عومەری کوڕی هەبیرە کە کاربەدەستی مروانی کوڕی محمد بوو لە عێراق. داوای کرد لە پێشەواکەیان پۆستی وا دەوری–قضاء– یان پۆستی خەزێنەداری دەوڵەت وەربگرێت بۆ ئەوەی هاوسۆزی و لایەنگریەکەی تاقی بکاتەوە، تا بزانێت ئەو هەواڵانە ڕاستن کە دەڵێن لایەنگر و دۆستایەتی نەوەکانی عەلی دەکات و بەپێی توانا هاوکاریشیان دەکات، کە لەو کاتەدا فیتنە و ئاژاوەگێڕی لە عێراق و خۆراسان لە ئەوجی سەرهەڵداندابوون، وورده وورده نەوەکانی عەباس هەرێمەکانیان دەکەوتە ژێردەست و ناوچەکانی ئەمەویەکانیش بەرتەسك دەبوویەوە.

ئەمەش دەقی وتەکانی(مەککی)یەکە لە ڕاویەکانەوە نقڵی کردووە و دەڵێ: ( (ابن هبیرە) والی شاری کوفە بوو لەسەردەمی ئەمەویەکاندا. لە عێراقدا ئاشوب سەری هەڵدا، ئەویش زاناکانی

عێراقی کۆکردەوە لە ماڵەکەی خۆیدا-کە لە نێوانیاندا-(ابن ابی لیلی)-و(ابن شبرمه)و(داودی کوڕی هند)ی تیابوو.

هەریەکە و پۆستێکی باڵای دایە دەستیان و ئەوانیش بەناچاری قەبووڵیان کرد، ناردی بەدوای پێشەوائەبوحەنیفەدا و داوای لێکرد ببیتە بەرپرسی(مۆر)واتە تا ئەو مۆری نەکات هیچ کتابێك دەرناچێت، ئەبوحەنیفەش قبوڵی نەکرد و وەری نەگرت، (ابن هبیره)یش سوێندی خوارد ئەگەر قەبوڵی نەکات ئەشکەنجەی ئەدەم.

زاناکانی هاوڕێی چوونە خزمەتی و داوایان لێکرد پۆستەکە وەربگرێت و وتیان: لەبەر خاتری خوا تکات لێ دەکەین خۆت لەناو مەبە، ئێمە براتین و هەمووشمان بەنابەدڵی ئەم کارەمان وەرگرتووە. پێشەوایش-بەڕەحمەت بێت- پێی وتن: ((خۆ ئەگەر داواشم لێبکات دەرگاکانی مزگەوتی واست چاك بکەم. بۆی ناکەم، جا وەرە ئەیەوێ لەمن کە بنوسێت دەدەین لە گەردنی فلان کەس و منیش مۆر و ئیمزای کەم بۆی، دەی سوێند بە (الله) هەرگیز ناچمە ئەو پۆستەوە))

(ابن ابی لیلی)یش ڕووی کردە زاناکانی هاوڕێ و وتی: وازی لێ بهێنن، ئەو لەسەر هەقە و ئێمە لەناو هەڵەداین. بەرپرسی پۆلیس پێشەوا دەگرێت و بۆ چەند ڕۆژێك ئەیخاتە ژێر ئەشکەنجە و

ئازارەوە، دواتر بەرپرسی پۆلیس هات بۆ لای (ابن هبیرە)ە، پێی وت وا بڕوات ئەو پیاوە لەژێر ئەشکەنجەدا دەمرێت.

(ابن هبیرە) پێی وت: بڕۆ داوای لێ بکە شتێك بکات با سوێندەکەمان نەکەوێت، ئەویش عەرزی پێشەوای کرد و پێشەوایش زۆر ئازایانە بە دەم ئازار وناڵەوە وتی: داوام لێبکات دەرگاکانی مزگەوتی واستیش چاك بکەم بەگوێی ناکەم. بۆیە بەرپرسی پۆلیس چووە بۆ لای(ابن هبیرە)و پێی وت: من ئامۆژگاریت دەکەم کە ماوەیەك دوای بخە با بیری لێ بکاتەوە و ئەویش ڕازی بوو. کە بە پێشەوای ڕاگەیاند وتی زۆر باشە با پرس و ڕایەك بە برا زاناکانم بکەم. (ابن هبیرە)یش ئازادی کرد و ئەویش سواری وڵاخەکەی بوو هەڵهات بۆ شاری مەککە لە ساڵی ١٣٠ی کۆچیدا بوو، لەوێ مایەوە تا ئەمەویەکان ڕووخان و عەباسیەکان دەسەڵاتیان گرتە دەست و پێشەوایش بە حورمەتەوە گەڕایەوە بۆ شاری کوفە ولەو کاتەشدا ئەبو جەعفەری مەنسور خەلیفە بوو))[٢٠].

ئا بەو جۆرە پێشەوا بە پێکەنین و خۆڕاگریەوە چووە بەردەمی قەمچی جەلادەکان، نەبینرا لێی بترسێت و نەرمی بنوێنێت و لە پرانسیپە ڕەواکانی دابەزێت، نەشبینراوە ئۆفێك ئاخێك، گریانێك، ناڵەیەك، فرمێسکێك لەکاتی سزاداندا لەچاوی هاتبێتە خوارەوە،

---

[٢٠] مناقب ابی حنیفە مەلکی ب١/لا ٢٣ و ٢٤.

تەنها ئەو چرکە ساتە نەبێت کە ئاگاداریان کرد کە دایکی زۆر دڵتەنگ و خەفەتبارە بە سزادان و ئەشکەنجەی کوڕەکەی و فرمێسك لەچاوی هاتە خوارەوە، بۆ سۆز و میهرەبانی دایك.

(ابن هبیره) بۆ ئەوەی هاوسۆزی پێشەوای بۆ دەرکەوێت لەگەڵیاندا دەستی کرد بە ئەشکەنجەدانی، زۆری لەزاناکانی سەردەمەکەی بە ناچاری قەبووڵی پێشنیارەکانی (ابن هبیره)یان کرد و گومانیان لەخۆیان دوور خستەوەیان خۆیان پاك کردەوە لە تۆمەتەکان، یان هەر ئەو سەبر و خۆڕاگریەی ئەبوحەنیفەیان نەبوو، لەڕێگەی(توقیه)وە خۆیان ڕزگار دەکرد.

وڵات بەجاریێ تێکچوو بوو، خۆراسان و فارس نیمچە ئازادکراویەکی پێوە دیار بوو لەلایەن عەباسییەکانەوە، عێراقیش تەواو ئاشوبی تێکەوت، سوپای عەباسییەکان هاتبوونە ناویەوە و وورده وورده لەهەموو هەرێمەکاندا دەسەڵاتی ئەمەویەکانیان کۆتایی پێ هێنا.

پێشەوا ئەبوحەنیفە هەرچەندە دڵ ڕەقی و بێ ڕەحمی سوپای عەباسییەکانیشی بەدڵ نەبوو. دوای ئەوەی بەرپرسی پۆلیس بواری ئازاد کردنی بۆ ڕەخساند، یەکسەر هەڵات بۆ شاری مەککە لەساڵی ١٣٠ کۆچیدا، لە مەککە نیشتەجێ بوو. کەعبە شوێنێکی ئارام بوو بە پێچەوانەی هەموو هەرێمەکانی تر لە ئاژاوە و ئاشوب گرتبوویەوە.

سەرلەنوێ هەڵقەی زانستی فیقهی و فەرموودە ناسی لە حەرەمی مەککەدا دامەزراندەوە و لەوێش بەجوانی زانستی (ابن عباس)ی وەرگرت، قوتابییەکانیشی لەهەموو جێگایەکەوە خۆیان پێ گەیاندەوە و لە هەڵقەکانیدا چۆکیان دادایەوە و لەکانیاوی زانستە لەبن نەهاتووەکەی بەهرەمەند بوونەوە.

ماوەی شەش ساڵ لە شاری مەککە نیشتەجێ بوو. کەواتە تا ساڵی١٣٦ی کۆچی لەژیانی حەرەمی کەعبەی پیرۆزدا بەردەوام بوو، تا سەردەمی ئەبو جەعفەری مەنسور هات و گەڕایەوە شاری کوفە.

## دیسان بەیعەت

لەکتێبی (مناقب ابی حنیفه)ی مەککی دا هاتووە کە دوای ئەوەی وڵات بۆ عەباسییەکان یەکلایی بوویەوە و (ابوالعباس السفاح)چووە شاری کوفە و داوای بەیعەتی لە دانیشتوانەکەی کرد. سەرەتا لە زاناکانەوە دەستی پێ کرد و دوای ئەوەی کۆی کردنەوە و وتارێکی بۆدان و پێی وتن:

((ئەوا بەرپرسیارێتی گەڕایەوە دەستی کەس و کاری پێغەمبەرەکەتان، خوا فەزڵ و گەورەیی خۆی لەگەڵ نواندن، هەق و ڕاست سەرخست، ئێوەش کۆمەڵی زانایان لە هەموو کەس زیاتر پێویستە پشتی بگرن و پشتگیری بکەن. خۆ گەر ئەوەشتان کرد،

هەموو خۆشەویستی و ڕێز و کەرامەتێکتان پێ دەبەخشرێت و پارە و ماڵی خودا دەدرێت پێتان بە ئارەزووی خۆتان، بەیعەتێکی وا بدەن بە پێشەواتان کە بەڵگە بێت بۆتان و لەسەریشتان، ئەمانیش بێت بۆ قیامەتتان تا نەگەڕێنەوە بۆ لای خوا بەبێ سەرکردە و ئیمام، ئەوکاتە هیچ قسەیەکتان پێ نەبێت)) .

خەڵکەکە هەموو سەیری ئەبوحەنیفەیان کرد و چاوەڕوانیان کرد ئەو قسە بکات لەباتی هەمووی، ئەویش وتی: (ئەگەر ڕازین و پێتان خۆشە من لەباتی هەموتان قسە دەکەم. وتیان: هەر زۆر پێمان خۆشە..).

ئەویش دەستی بە قسەکردن کرد و وتی: ((سوپاس بۆ ئەو خوایەی هەق ڕاستی سەرخست لەسەر دەستی خزم و کەسەکانی پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم)و ستەمی ستەمکارانی لەسەر هەڵگرتین، زمانی کردینەوە کە بتوانین هەق بڵێین، ئەوا بەیعەتمان پێدایت لەسەر فەرمانی خوا، بەوەفاش دەبین لەسەر ئەو عەهد و پەیمانەی کە پێت ئەدەین تا ڕۆژی قیامەت، ئەم کارەش لە کەسوکاری پێغەمبەرەکەی هەرگیز وەرناگرینەوە)).

ئەبولعەباسیش بە وەڵامێکی جوان وەڵامی دایەوە و وتی: ((وێنەی تۆ هەر وتار بدات لەناو زانایاندا، بەڕاستی چاك هەڵیان بژاردوویت، تۆش جوان گەیاندت )). کە چوونە دەرەوە بە

پێشەوایان وت: مەبەستت چی بوو وتت تا ڕۆژی قیامەت؟ وتی: ((فأن أحْتَلَتم عليّ إحتلت عَليكم وَ أسلمتكم للبلاء)) هەموویان بێدەنگ بوون کە زانیان لەسەر هەقە[21].

سستی نواندنی زاناکان لە بەیعەت دان بە(سەفاح)و دیاری کردنی ئەبوحەنیفە بۆ ئەو کارە لەوە سەرچاوەی گرتبوو کە:

یەکەم: هێشتا بەیعەتی ئەمەویەکانیان لە گەردندا بوو هەروەك هەندێکیان کاربەدەستی باڵا بوون لە دەوڵەتەکەی بەنی ئومەمەیەدا.

دووەم: زاناکان سەرجەمیان یان زۆربەیان ڕازی بوو بوون بە دەسەڵاتی ئەمەویەکان و پۆستی جیاجیاشیان وەرگرتبوو تیایدا. بەڵام ئەبوحەنیفە تا ژیا ڕازی نەبوو بە بەیعەتدان بە بەنی ئومەیە و هەر نەیاری کردوون، بۆیە ئەگەر ئەو بە حوکمی عەباسی ڕازی بێت ئەوە ئەوانیش ڕازی دەبن.

* * *

---

[21] هەندێ لە زانایان دەڵێن مەبەستی لە تا(قیام الساعه)تا ئەو کاتەی لەم شوێنە هەڵئەسین،هەندێ تر دەڵێن تا ئەو سەعاتەی ئێوە زوڵم و غەدر دەکەن..

## پێشەوا لە سەردەمی عەباسییەکاندا

پێشەوا ئەو زوڵم و ستەمەی بەچاوی خۆی دەبینی کە لەنەوەکانی عەلی دەکرا لەلایەن ئەمەویەکانەوە، کە بواریان پێ نەئەدان بگەنە کورسی دەسەڵات و دەوڵەتی عەباسیشی بە دەوڵەتێکی ئەسڵ شیعە سەیر دەکرد، چونکە لە ئەسڵدا دەوڵەتێکی هاشمیە لە نەوەکانی هاشمی باپیری پێغەمبەرن و هەستیان ئەکرد لە سایەی ئەم دەوڵەتەدا بە ئارامی دەژین، پاشانیش بە ئاشکرا دەریانەبڕی کە بۆ تۆڵەسەندنەوە هاتوون لەو ستەمەی لە نەوەکانی عەلی کراوە و کەسیش ئەوەندەی ئەوان شایانی ئەو کارە نییە.

لەبەر ئەم هۆیانە بوو کە پێشەوا زۆر دڵخۆش بوو بە بەرپابوونی ئەم دەوڵەتە نوێیە، یەکسەر بەیعەتی دا بە یەکەم خەلیفەی و وتارەکەشی بە ئاشکرا سۆز و خۆشەویستی بۆ کەسوکاری پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)تێدابوو، هاندانی زاناکانی هاوڕێیشی تێدا بوو بۆ بەیعەتدان پێیان.

پێشەوا بەردەوام بوو لە پشتگیری و لایەنگری خۆی بۆ(بنی العباس)و خۆشەویستی بۆ کەس و کاری پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)بە گشتی.

تەنانەت (ابو جعفر المنصور) لەخۆی نزیکی دەکردەوە و ڕێزی لێ دەگرت و پلە و پایەی بەرز ئەکردەوە، چەندان دیاری و

بەخششی شایستەی بۆ ئەنارد، هەرچەندە ئەم زانا مەزنە بە ژیرانە و لەسەرخۆ ڕەدی ئەکردنەوە و وەری نەدەگرت، چونکە دیاری و خەڵاتی وەرنەگرتووە.

جارێکیان ناکۆکییەك لە نێوان مەنصور و خێزانیدا ڕوودەدات بەهۆی ئەوەی کە مەنصور حەزی لێی نەمابوو، ویستی سەرلەنوێ ژنێکی تر بهێنێت، خێزانیشی داوای لێکرد دادپەروەر بێت لە نێوانیان.

خەلیفەیش وتی: بەکێ ڕازیت لە حکومەت دادوەر بێت لە نێوانمان؟ خێزانی وتی: تەنها بە ئەبوحەنیفە، ئەویش پێی ڕازی بوو، بانگی کرد پێی وت: ئەبوحەنیفە، حورەی خێزانم دژایەتیم دەکات، بە ویژدانەوە دادوەریمان بکە، ئەبوحەنیفە وتی: با گەورەی باوەڕداران قسەی خۆی بکات ئەویش وتی: ئەبوحەنیفە بۆ پیاوان هەیە تا چەند ژن بهێنن و پێکەوە کۆیان بکەنەوە؟ وتی: چوار ژن، وتی: ئەی چەند کەنیزەك؟ وتی: هەرچەندێ بتوانێت سنوری نییە.

وتی: دەی ئایا بۆ کەس هەیە پێچەوانەی ئەمە بڵێت؟ وتی: نەخێر، ئەبو جەعفەریش ڕووی کردە حورە و وتی: خۆ گوێت لێ بوو؟ پێشەوایش تێگەیشت بۆیە وتی: ژنی دووەم بۆ ئەو کەسانە حەڵاڵە کە ئەتوانن دادپەروەربن لەنێوان ژنەکانیان، بەڵام ئەوەی دادپەروەرنەبێت یان بترسێت لەوەی دادپەروەرنابێت، پێویستە یەك

ژن زیاتر نەهێنێت و قورئانیش ئەفەرموێت: ﴿ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُواْ فَوَاحِدَةً ﴾ کەواتە پێویستە لەسەرمان بە ڕەوشتی خوایی خۆمان برازێنینەوە و بە فەرمانەکانی ئامۆژگاری وەرگرین.

لەو کاتەدا ئەبو جەعفەر بێ دەنگ بوو بۆ ماوەیەکی زۆر، لەو کاتەدا پێشەوا ئەبوحەنیفە بە ئەسپایی هەستا و ڕۆشتە دەرەوە کە گەیشتەماڵەوە -لە پاداشتی ئەو فەتوایەدا- خزمەتکارێك و پارە و جلوبەرگ و کەنیزەکێك و گوێدرێژێکی میسری بۆ نارد، پێشەوایش بە خزمەتکارەکەی وت: سڵاوی من بگەیەنە خێزانی خەلیفە و پێی بڵێ: من لە پێناو ئاینەکەمدا ئەوەم کردووە و لەبەر خوا ئەو فەتوایەم داوە، نەك بۆ ئەوەی لەبەر نزیك بوونەوەم لە کەسێك یان دەستکەوتنی ماڵی دونیا.

## لە عەباسییەکانیش هاتە دەنگ

هیچ کەس ئەوەی نقڵ نەکردووە کە پێشەوا ئەبوحەنیفە ڕۆژێ لە ڕۆژان دژایەتی عەباسییەکانی کردبێت، تا ئەوە بوو لە لایەن نەوەکانی عەلییەوە دژایەتیکردن و دەرچوون دژی خەلیفەی موسوڵمانان ڕاگەیەنرا، دژایەتیکردنەکە تا دەهات بەهێز دەبوو، ئاشکرایشە پێشەوا ئەبوحەنیفەیش خۆشەویستی و لایەنگریەکی

ڕوون و ئاشكرا و حاشا هەڵنەگری هەبووە بۆ كوڕانی عەلی (خوا لێی ڕازی بێت) ئیتر سروشتییە دژایەتی هەركەسیان كرد ئەویش دژایەتی بكات، بە تایبەتیش ئەگەر ئەوانەی سەركردایەتی شۆڕشەكە دەكەن دژی ئەبو جەعفەری مەنصور هەردوو برا محمد(النفس الزكیه)و ئیبراهیمی برای بێت، چونكە پێشتر پێشەوا ئەبوحەنیفە پەیوەندی زانستی گەورەی هەبووە لەگەڵ عبداللەی كوڕی حەسەنی باوكیان.

تەنانەت ئەوانەی ژیاننامەی پێشەوایان نووسیوەتەوە بە یەكێ لە مامۆستاكانی دایانناوە كە فەرموودەی لێوە گێڕاوەتەوە، پاشتر بە درێژتر ڕوونی ئەكەینەوە، كە ئەو(عبدالله)یە كاتێك كوڕەكانی دەرچوون و دژایەتیان دژی خەلیفە ڕاگەیاند ئەو لە زیندانەكانی مەنصوردا بوو، دوای شەهید بوونی هەردوو كوڕەكەی لە زینداندا گیانی سپارد.

ئیتر لەو كاتەوە پێشەوا ڕای گۆڕا لە عەباسییەكان و دۆستایەتیكردنیانی بە گونجاو نەدەزانی، بەڵام هەروەك سەردەمی ئەمەویەكان تەنها دژایەتیكردنەكەی ڕەخنەگرتن و زەمكردنیان لەوانە و هەڵقە زانستییەكانیدا، لەبۆنە جیاكاندا هاوسۆزی خۆی بۆ نەوەكانی عەلی دەردەبڕی، بەڵام شمشێری لێ هەڵنەبڕی و بانگەشەی بۆ ئاژاوە نەكردووە.

وەکو پیشەی هەموو زانایان کە هیچ شتێك لە زانست و زانیاریان ناخات، مەگەر کەمێکی کەم کە هەستیانی پێ ڕازی بکەن لە خۆشویستن و دژایەتیکردن، خۆ ئەبو جەعفەریش ئەیزانی و گومانی ئەوەی پێ دەبرد بۆیە جار بەجار پشتگوێی ئەخست و جار بەجاریش تاقی ئەکردەوە تا سەردەمی نەهامەتییەکان (المأساه).

کورتەکەی بەم شێوەیە بوو کە پەیوەندی بە پێشەواوە هەبێت: ( محمد النفس الزکیه) لە شاری مەدینەوە دژایەتی مەنصوری ڕاگەیاند لەساڵی(١٤٥) ی کۆچیدا و خەڵکی خۆراسان لایەنگری بوون، بەڵام بەهۆی دوورییانەوە لێی نەیانەتوانی پشتگیری بکەن بە سوپا و بە دارایی هەرچەندە خۆشەویستی و وەلائیان بۆی هەبوو.

ئەگێڕنەوە پێشەوا مالیك لە مەدینە فەتوای داوە کە دروستە لەگەڵ محمد بەشداری شۆڕش بکەن دژی خەلیفە، لە مێژووی(ابن کثیر)و(ابن جریر)دا هاتووە: کە پێشەوا مالیك فەتوای داوە کە بەیعەت بدرێت بە محمدی کوڕی عبدالله، کە لەو بارەوە پێیان وت: ئێمە بەیعەتی مەنصورمان لە گەردندایە، وتی: بەزۆر بەیعەتیان پێ داون و بەیعەتەکەتان دانەمەزراوە، لەسەر قسەی مالیك هەموو خەڵکی مەدینە بەیعەتیان پێدا[٢٢].

---

[٢٢] البدایة و النهایة،ابن کثیر ب ١ ٨٤٧.

لەئاکامدا شۆڕشەکەی محمد بە کوشتنی کۆتایی هات، ئیبراهیمی برایشی لەزۆرێ لە شارەکانی ڕزگار کردبوو، لەکاتی هێرشکردنی بۆ کوفە شەهیدکرا.

پێشەوا مالیك لەسەر فەتواکەی سزادرا بە لێدان و ئەشکەنجەدان، بەڵام پێشەوا ئەبوحەنیفە زۆر لە هەڵوێستەکەی مالیك توند تربوو ئەو هەر بە ئاشکرا لە وانەکانیدا پشتگیری خۆی بۆ دەردەبڕین، نەك هەر ئەوە بەڵکو کار گەشتە ئەوەی هەندێ لە سەرکردە سەربازیەکانی مەنصوری لە جەنگ کردن دژیان سارد ئەکردەوە، دەڵێن(حسن)ی کوڕی(قطبة)کە سەرکردەیەکی سەربازی مەنصور بوو، هاتە خزمەت پێشەوا ئەبوحەنیفە و پێی وت: کارەکەم لەلای تۆ شاراوە نییە، ئایا بۆم هەیە تەوبە بکەم. وتی بەڵێ ئەگەر خوا زانی تۆ بەڕاستە لە تەوبەکردنەکەت. کە ئەگەر سەرپشك بکرێیت لەنێوان کوشتنی خۆت و کوشتنی موسوڵمانێك تۆ کوشتنی خۆتت هەڵبژارد و پەیمان بەخوا بدەیت کە هەرگیز جارێکی کە نەگەڕێیتەوە سەر کارەکانی پێشوت، ئەگەر وات کرد ئەوە تەوبەکردنی تۆیە.

حەسەنیش وتی: من ئەمە دەکەم و پەیمانیشم بە خودای گەورە داوە نەگەڕێمەوە سەر کوشتنی موسوڵمان.

هەر کە شۆڕشەکەی ئیبراهیمی کوڕی عبدالله الحسن العلوی سەری هەڵدا، مەنصور فەرمانی پێکرد بڕوات بۆی، ئەویش هاتە خزمەت

پێشەوا و بۆی گێڕایەوە. ئەویش پێی وت:ئێستا کاتی دەرکەوتنی ڕاستی تەوبەکەتە، ئەگەر بەڵێنەکەت بەریتە سەر ئەوە تەوبەکەت دروستە و وەرگیراوە، گەرنا لەسەر یەك بە یەك لێپرسینەوەت لەگەڵ دەکرێت.

حەسەنیش وتی: وا ئەکەم و خۆی بۆ کوشتن ئامادە کرد، هاتە ژوورەوە بۆلای مەنصور و وتی: من بۆ ئەو جێگایە ناڕۆم، چونکە ئەوەی لەمەوپێش بۆم کردوویت ئەگەر گوێڕایەڵی خوا بووبێت ئەوە زۆرم کردووە و بەسمە، ئەگەر ئەو کارانەشم تاوان بووبێت بەسمە ئیتر، ئیتر مەنصور زۆر توڕە بوو، حمیدی کوڕی(قحطبة)ی برای فریای کەوت و وتی: گەورەم هەموومان نزیکی ساڵێکە گومانمان لە عەقڵی کردووە، وادیارە خەڵەفاوە و عەقڵی لەدەست داوە، من ئەڕۆم بۆیان، من لە ئەو لە پێشترم بۆ ئەو ئەرکە گەورەیە، ئەو ڕۆیشت، مەنصوریش پرسی لە هەندێ متمانە پێکراوەکانی ئایا حەسەن هاتووچۆی کام لە زاناکان دەکات؟وتیان: ماوەیەکە هاتووچۆی ئەبوحەنیفە دەکات[٢٣].

ئەگەر ئەم ڕیوایەتە(صحیح)بێت، ئەم کارەی پێشەوا لەکارە ترسناکەکانە دژی دەوڵەتەکەی، چونکە لە سنوری ڕەخنەی ڕوت دەرچووە، لە خۆشەویستی دڵ دەرچووە و چۆتە بواری کردار، خۆ

---

[٢٣] مناقب ابی حنیفە(ابن بزازی)ب١ لا٢٢.

هەرچەندە کارەکەشی تەنها فەتوادان بووە و کەسی(مفتی)یش لەسەری پێویستە ئامۆژگاری خەڵکی بکات، لە ئاینی ئیسلامدا بەبێ گرتنی لایەنی بەتاڵ و جوانکردنی گەندەڵی و ناهەقی کردن بە هەق.

خۆ ئەم کارانەی پێشەوا ئەبوحەنیفە لەلای مەنصور شاراوە نەبوو، کە هەمیشە خستبوویە ژێر چاودێری خۆی، بە تایبەتیش ئەو لە کوفەدا بوو، بۆیە هەلێك هاتە پێش و ویستی لایەنگری و گوێڕایەڵیشی پێشەوا تاقیکاتەوە، لەو کاتەدا مەنصور بەغدادی دروست ئەکرد، ویستی بیکات بە قازی شاری بغداد،بەلآم ئەو ڕەدی کردەوە، نەیکرد. مەنصوریش سور بوو لەسەر ئەوەی کە هەر دەبێت پۆستێك وەربگرێت، ڕاشکاوانە لە شاراوەکانی جیاکاتەوە و نیەت و نیازی ئاشکرا بکات.

پێشەوا بۆی دەرکەوت مەبەستی مەنسور ئەوەیە بدات لە گەردنی بۆیە ویستی ئەم حەز و ئارەزووەشی لێ تێك دا.ئەگێڕنەوە ڕازی بوو سەرپەرشتی خشت برین بکات بۆ دیواری دەوری بەغداد، (ابن جریر الطبري) هێناویەتی کە مەنصور ویستی بیکات بە قازی بەغداد بەلآم ئەو ڕازی نەبوو، مەنصور سوێندی خوارد کە هیچ پۆستێك وەرنەگرێت. بۆیە کاری سەرپەرشتی بونیات نانی بەغدا وبڕینی خشت بۆ دیوارەکەی و ئامادەکردنی پیاوان بۆ کارکردن تیایدای دا

بەسەریدا و ئەویش ڕازی بوو، تا ئەوە بوو لێ بوونەوە لە دروست کردنی دیواری چواردەوری بەغداد لە ڕووی خەندەقەکەوە.

هەیسەم لە(عەدی)وە دەگێڕێتەوە کە مەنصور کاری دادوەری دا بەسەر پێشەوادا و ئەویش وەری نەگرت، بۆیە سوێندی خوارد وازی لێ نەهێنێ تا ڕازی دەبێت و کارێکی بۆ دەکات، کاتێ هەواڵیان دا بە ئەبوحەنیفە، هەستا چوو قامیش و قوڕ و خشتی هێنا و لە دیواری بەغداد کاری کرد، تا سوێندەکەی خەلیفە نەکەوێت[٢٤].

ئەم تاقیکردنەوە قورسەش لەکاتێکی زۆر ترسناکدا بوو کە شۆڕشی عەلەویەکان لە شکستدا بوو، زۆربەی سەرکردە و لایەنگر و زاناکانیان لە زیندانەکانی مەنسوردا بوون، توانی بۆ ماوەیەکی کەم-تا سەر نا-لە ڕق و تۆڵەی مەنسور دەربازی ببێت، چونکە وەك عادەتی زانا لە خوا ترسە بە غیرەتەکان هەر سور بووە لەسەر وتەی هەق و هەر ناڕازی دەربڕیوە لە ستەمی دەسەڵاتداران و دژایەتیکردنیان بۆ کەس و کاری پێغەمبەرەکەیان (صلی الله علیه وسلم)، بەڵام مەنصور هەر لێپرسینەوە قورسەکەی پێشەوای دوا ئەخست بەڵام بیری نە ئەچوویەوە. بێگومان ئەوکاتەی مەنصور ئارامی نەما و بە ناهەق پێشەوای ڕاپێچی زیندانەکانی بەغداد کرد و دەستکرا بە توندترین ئەشکەنجەدانی، خۆ هیچ شۆڕشێکی

---

[٢٤] تاریخ ابن کثیر ب١٠ لا ٩٧.

عەلەویەکان لە ئارادا نەبوو. پێنج ساڵ پێش ئەمە و لەساڵی(١٤٥) ی کۆچیدا ئیبراهیمی کوڕی عبدالله شەهیدکرا و شۆڕشەکەی کوژایەوە!.

و ئەو ڕیوایەتە زۆر دوورە لە ڕاستییەوە کە خەتیب لە (تأریخ بغداد) دا هێناویەتی: کە زوفەر بە پێشەوای وتوە- لەکاتی شۆڕشەکەی ئیبراهیم دا:

ئەبوحەنیفە بە ئاشکرا پشتی دەگرت و دژی دەسەڵات دەوەستایەوە لە وانەکانیدا: ((سوێند بەخوا تۆ وازناهێنی تا ملمان بە پەتەوە نەکەیت، ئەوەندەی پێ نەچوو نامەی گرتنی لەلایەن مەنصورەوە هات و بردیان بۆ بەغدا و تەنها(١٥) ڕۆژ ژیا لە زینداندا)).[٢٥]

ئەم ڕیوایەتە تەنها دێڕەکەی کۆتایی ڕاستە، ئەگینا ئەسڵەن لەکاتی شۆڕشەکەی ئیبراهیم دا پێشەوا نەگیراوە و پێنج ساڵ دوای ئەوە گیراوە چونکە لەساڵی(١٥٠) کۆچیدا کۆچی دوایی کرد لە زینداندا.

* * *

---

[٢٥] تأريخ بغداد ب١٣ لا ٣٣.

## دوو ڕووداوی تاڵ بۆ پێشەوا

دوای ئەوەی کە ئەبو جەعفەری مەنسور شۆڕشەکانی عەلەویەکانی سەرکوت کرد و سەرکردەکانی کردنە زیندان، تەنانەت زۆریشی لێ شەهیدکردن، بۆیە پێشەوا بە دەوڵەتی عەباسی ئاسوودە نەبوو هەر بەیناوبەینێك لەوانەکانیدا و لەکۆڕی زانایاندا ئەم حاڵەی خۆی ئاشکرا دەکرد و قسەی هەقی دەکرد، باسی ستەمکاری مەنصور و کاربەدەستەکانی دەوڵەتی دەکرد. بەڵام هیچیان وەك ئەم دوو ڕووداوە کاریگەر نەبوون لەسەر دڵی مەنصور و نەبوونە هۆی دەستگیر کردن و ئەشکەنجەدانی لە زیندانا و دواتر مردنیشی هەر لە کونجی زیندانەکاندا.

### ڕووداوی یەکەم:

خەڵکی موصل بە حوکمی مەنسور ڕازی نەبوون و ویستیان بەیعەتەکەی گەردنیان هەڵبوەشێننەوە کە بە مەنسوریان دابوو، مەنسوریش کاتی خۆی وەعدی لێ وەرگرتبوون کە ئەگەر هات و پەیمانیان شکاند خوێنیان حەڵاڵ دەبێت بۆی.

بۆیە هەموو زاناکانی کۆکردەوە کە پێشەوایش یەکێك بوو لەوانە، پێی وتن: ئایا لە پێغەمبەرەوە(صلی الله علیه وسلم) فەرموودەی

صحيح ڕیوایەت نەکراوە کە فەرموویەتی: (المؤمنون عند شروطهم)[26] خەڵکی موسڵیش مەرجیان لێ گیراوە کە لێم هەڵنەگەڕێنەوە، کەچی لە کاربەدەستەکەم هەڵگەڕاونەتەوە، کەواتە خوێنیان بۆ من حەڵاڵ بووە. پیاوێك وتی: تۆ دەست کراوەیت بۆیان، وتەکەت تەواوە لەسەریان، ئەگەر لێیان ببوریت تۆ ئەهلی لێبوردنیت، ئەگەر سزاشیان بدەیت ئەوە خۆیان شایستەی ئەوەن.

لای کردەوە بەلای ئەبوحەنیفەدا و پێی وت: ئەی تۆ مامۆستا چی دەڵێیت؟ ئایا ئێمە خەلافەتی پێغەمبەرمان نییە و خانەوادەیەکی ئاشتی و ئەمان نین؟ پێشەوایش-بێ ترسانە-وتی: ((ئەوان مەرجێکیان داناوە کە مافی ئەوان نییە و تۆش مەرج گەلێکت لێ گرتوون کە مافی ئەوەت نییە، چونکە خوێن ڕشتنی موسوڵمان حەڵاڵ نییە بۆ کەس، مەگەر بە یەکێ لە سێ مەرجەکە[27]، ئەگەر لێیان بدەیت بە ناڕەوا لێیان دەدەیت، مەرجی خوایش لەپێش ترە جێبەجێ کردن. پاشان مەنصور داوای لێکردن بگەڕێنەوە هەموو هەستان و چوونەدەرەوە پاشان پێشەوای هێشتەوە بە تەنها و دوو بەدوو و پێی وت: خۆ قسەکەی تۆیە مامۆستا، بەڵام بڕۆرەوە بۆ شارەکەی خۆت،

---

[26] واتە: مسوڵمانان دەبێت پابەندبن بە مەرجەکانیانەوە.

[27] المناقب لابن البزازی ب۲ لا ۷۱.

بەجۆریَ فەتوا مەدە خەڵکی لە پێشەواکەت هەڵگەڕێنیتەوە و دەستی خەواریجەکان واڵا بکەیت))[28].

ڕووداوی دووەم:

یەکێکی تر لەو شتانەی کە بەڕوونی بۆچوونی پێشەوای دەرخست سەبارەت بە دەسەڵات و ئەبو جەعفەری مەنسور:

مەنسور دیاریەکی گەورەی نارد بۆ پێشەوا تا تاقی بکاتەوە بزانێت وەری ئەگرێت. لە(مناقب)ی (المکی)دا هاتووە: کە ئەبو جەعفەر(١٠) هەزار درهەم و کەنیزەکێکی بە خەڵات بۆ نارد، دیاریەکانی بە وەزیرەکەیدا نارد (عبدالملك)ی کوڕی(حمد)کە پیاوێکی ماقولّ و خاوەن ڕەئی بوو، کاتیَ ئەبوحەنیفە (ڕەحمەتی خوای لێبێت) خەڵاتەکانی ڕەدکردەوە و وەرینەگرت پێی وت: ((بۆ خوا پێت دەڵێم ئەمیری باوەڕداران بۆ بیانوویەك ئەگەڕیَ تا بیدۆزێتەوە تێیدا. ئەگەر ئەم دیاریانە وەرناگری ڕەحمیَ بەخۆت بکە و ئەو گومانانەی لەسەر تۆ هەیەتی، مەیهێڵە. پێشەوا لەو کەسانە نییە پارە و ماڵی دونیا بیخەڵەتێنیَ و لە خشتەی بەرێت، ئەویش پێی وت: پارەکان وەرگرە و وابزانە خەڵاتی کردوویت و کەنیزەکەکەش لەمنی وەرگرە، یان هۆکارەکەیم پیَ بڵیَ کە وەری ناگریت تا بیانوت بۆ بهێنمەوە لای

---

[28] المناقب لابن البزازی ب٢ لا ٧١.

گەورە باوەڕداران، پێشەوایش وتی: من چووم بە تەمەندا و ژنم ناویّ و ناشتوانم دیاری گەورەی باوەڕداران بفرۆشم)).

ئەمە چەند نموونەیەك بوو لەوەی کە لە نێوان منصور و پێشەوادا ڕووی دەدا و مەنصوریش لە کەمیندا بوو بۆی و چاوی لەسەری بوو، هەروەك چواردەورەکەشی هانیان دەدا و گومانیان بۆ دروست دەکرد لەسەر وتەکانی و فەتواکانی، بەڵام ئەو هەر بەردەوام بوو لەسەر فەتوا و وتەکانی خۆی کە بەڕاستی دەزانین و گرنگ نەبوو لەلای کە لێی ڕازی دەبن یان نیگەران، گرنگ ئەوەبوو کە خوای گەورەی لیّ ڕازی بێت و ویژدانی خۆی ئاسوودە بکات، بەردەوامیش دەست و پێوەندەکەی مەنسور هەر خەریکی خۆشکردنی ئاگرەکە بوون، ڕقیان لە دڵیدا دروست دەکرد بەرامبەری پێشەوا.

خەتیبی بەغداد لە(ابی یوسف)ەوە دەگێڕێتەوە کە: ((جارێك مەنصور پێشەوا ئەبوحەنیفە بانگ دەکات بۆ کۆشك، پاسەوانەکەی مەنصور ناوی رەبیع بوو– زۆر دژایەتی پێشەوای دەکرد– وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەم ئەبوحەنیفەیە لە فیقهەکەیدا دژایەتی عبداللەی کوڕی عەباسی باوات کە دەکات و دەڵیّ: هەرکەسیّ سوێندێکی خوارد دوای ڕۆژیّ یان دوو ڕۆژ ئەتوانیّ بڵیّ جگە لە فڵان شت واتە(إستثناء)دوابخات دروستە.

بەڵام ئەم ئەبوحەنیفەیە دەڵیّ: ئەبیّ سوێندەکە و(إستثناء)کردنەکە هاوکات بن و پێکەوە بیکات. پێشەوایش ڕووی کردە مەنصور وتی:

ڕەبیع وا ئەزانییەك سەرباز لە سەربازەكانت بەیعەتی تۆ نییە لە گەردنیاندا. مەنصور وتی: چۆن! چونكە ئەتوانن سوێند بخۆن لەلای تۆ و كە چوونەوە بۆ ماڵ(إستثناء)بكەن، لە بەیعەتەكەی تۆ بچنە دەرەوە. مەنصوریش دەستی كرد بە پێكەنین و بە ڕەبیعی وت: ڕەبیع تۆ لەگەڵ ئەبوحەنیفە دا دەرناچیت. ڕەبیعیش وتی: ویستم خوێنم بجولێنم، مەنصوریش وتی: نا، بەڵكو ویستت خوێنی من بجولێنی و خۆمیش و تۆیشم لەو خوێنە ڕزگار كرد))[29].

هەروەها خەتیب ئەگێڕێتەوە: (ابوالعباس الطوسي)ڕای خراپ بوو دەربارەی ئەبوحەنیفە و ئەبوحەنیفەیش بەمەی دەزانی. ئەبوحەنیفە چوو بۆ لای ئەبو جەعفەر و خەڵكێكی زۆر هاتن، (طوسي) وتی: ئەمڕۆ ئەبوحەنیفە ئەكوژم، بەرەو ڕووی ڕۆشت و پێی وت: ئەی ئەبوحەنیفە، گەورەی باوەڕداران فەرمان دەردەكات یەكێ بكوژین و هەر ناشیناسین، بۆمان هەیە بدەین لە ملی و بیكوژین؟

ئەبوحەنیفەیش وتی: ئەی(ابا العباس)ئەو كەسە هەقی كوشتنی هەیە یان نییەتی؟ وتی: هەقیەتی، پێشەوا وتی: فەرمانەكە جێبەجێ بكە و لەكەس مەپرسە. پاشان ڕووی كردە هاوڕێكانی و وتی: ویستی بمبەستێتەوە من ئەوم بەستەوە.

* * *

---

[29] تاریخ بغداد ب١٣ ل ٢٦٥ .

## پێشەوا حوکمی قازیەکان هەڵدەوەشێنێتەوە:

جێگای خۆیەتی لێرەدا بڵێین هەڵوێستێکی ئەبوحەنیفە هەیە کە بوو بە بیانویەك بۆ خەلیفە کە سزا و ئەشکەنجە دابەزێنێ بۆ پێشەوای مەزن ئەبوحەنیفە.

لە چەندان لاوە دەگێڕنەوە کە پێشەوا (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) بواری نە ئەدا قازیەکانی کوفە ڕای هەڵە و پێچەوانەی قورئان و فەرموودە دەربکەن، هەر لەگەڵ دەرچوونی بڕیارەکەدا یەکسەر ناشەرعی بڕیارەکەی ڕوون دەکردەوە، ئەوەش بوو بووە هۆی نیگەرانی قازی کوفە لێی و گومانی خراپی پێ دەبرد، لەلای ئەمیر و کاربەدەستەکان سکاڵای لێ دەکرد، بەڵکو تەنانەت (ابن ابی لیلی) کە قازی کوفە بوو شکاتی لێکرد و لە ئاکامی ئەو شکاتەدا لە فەتواداان قەدەغەکرا ماوەیەك و دواتر ڕێگەی پێ درایەوە.

لە کتێبەکانی (مناقب)و(تأریخ بغداد)دا هاتووە کە قازی (ابن ابی لیلی) دەربارەی ئەو ژنە شێتەی بە پیاوێکی وتبوو: ئەی کوڕی دایك و باوك زیناکار، حوکمی دەرکردبوو: کە لە مزگەوتدا حەد لە ژنەکە بدرێت، بە پێوە بێت، دوو حەدی لێ دا یەکێکیان لەبەر دایکی و یەکێکیان لەبەر باوکی.

کە هەواڵەکە گەشتە ئەبوحەنیفە وتی: (ابن ابی لیلی) شەش جار هەڵەی کردووە لەم حوکمەیدا.

یەکەم: لە مزگەوت حەدەکەی جێبەجێ کرد، شتی وا لە مزگەوتدا ناکرێت.

دووەم: بەپێوە لێ دا لە کاتێکدا دەبێ ئافرەت بە دانیشتنەوە حەدی لێ بدرێت.

سێ یەم: حەدێکی بۆ دایکی و حەدێکی بۆ باوکی لێدا لە کاتێکدا گەر کەسێ کۆمەڵێ لەکەدار بکات بە زینا، هەر یەك حەدی لێ ئەدرێت.

چوارەم: دوو حەدی بەسەر یەکەوە لێدا کە دوو حەد بەسەر یەکەوە لێ نادرێت تا یەکێکیان ئێشی نەمێنێت.

پێنجەم: حەدی دا لە ژنەکە کە شێت حەدی لێ نادرێت.

شەشەم: حەدێکیش بۆ دایك و باوکی کە ئەوان دیار نەبوون و لەوێ نەبوون تا دەعوای خۆیان تۆمار بکەن.

ئەم هەواڵە گەیشتەوە (ابن ابی لیلی)و ئەویش چوو بۆ لای کاربەدەستان و سکاڵای لەسەر کرد، بەوهۆیەوە فەتوادان قەدەغەکرا لە پێشەوا (ئەبوحەنیفە)، وتی: بۆی نییە فەتوا بدات. چەند ڕۆژێك فەتوای نەدا تا ڕۆژێکیان نێردراوی شازادەی جێنشین هات بۆ لای ئەبوحەنیفە چەند مەسەلەیەکی خستبووە بەردەستی تا فەتوای تێدا بدات.

پێشەوایش وتی: من ناتوانم فەتوا بدەم، من فەتوادانم لێ قەدەغەکراوە، پیاوەکەش ڕۆشتەوە و شازادەی جێنشینی ئاگادار کردەوە و ئەویش فەرمانی دەرکرد دەستبکاتەوە بە فەتوادان و ئەویش دەستی پێ کردەوە[20].

پێشەوا لەم کارەشیدا گوێی نەداوە بەوەی هەستێ بە هەڵوەشاندنەوەی حوکمی قازی، کە جێبەجێ کردنی بەدوادا دێت یان حوکمی فەتوای فەقیهێك بێت کە جێبەجێکردنی ئارەزومەندانەیە. بەڵکو زیاتر گرنگی داوە بەو حوکم و فەتوایانەی لە قازی و دەزگاکانی دەوڵەتەوە دەردەچێت، ئەگەر هەڵەیەکی تیابێت ئاکامەکەی ترسناکترە لە فەتوای فەقیهێکی ئاسایی، چونکە لەوانەیە ستەمێکی تێدا بکرێت یان کەسێکی پێ بکوژرێت یان پارە و سامانێکی بە ناڕەوا پێ بپچڕێت بۆ کەسێك.

هەرچەندە ئاواتەخوازبووین ئەو زانا مەزنە لێهاتووە، ئەو پێشەوا ناوازەیە، کە سامانێکی ئوممەتی ئیسلام بوو، خۆزگە بە نامە یان بە چاوپێکەوتنی نهێنی ئەو هەڵانەی بۆ ڕاست کردنایەتەوە، چونکە هەموو کەس ڕێزی خۆی هەیە و نابێ ئەو ڕێزەی بشکێنرێت یان ئاوی دەم و چاوی بتکێت. زانایەکی وەك (ابن ابی لیلی و ابن شبرمە) کە مەکانەت و مەقامێکی گەورەیان هەبوو چ لەلای عەباسیەکان یان لە

---

[20] المناقب لابن البزازی ب١ ص١٦٦. تأریخ بغداد ب١٣ لا ٣٥٦.

دڵی موسوڵمانانی ئەو سەردەمەدا. هەر کەسێکی تربوایە پێی ناخۆش دەبوو لەبەرچاوی ڕای گشتی فەتواکانی بەناڕاست بدرێتە قەڵەم.

بەهەرحاڵ ئەمە بەهانە نەبوو بۆ مەنصور کە ئەو زانا مەزنە خاوەن مەزهەبە ڕاپێچی زیندان بکات و لەژێر ئەشکەنجەدا شەهیدی بکات.

یان بەهانە نییە بۆ زانایەکی هاوڕێی پێشەوا ئەبوحەنیفە لەبەر ئەوەی هەڵەی بۆ ڕاست کردۆتەوە، دوژمنایەتی بکات لەلای دەوڵەتی عەباسی ناشرینی بکات. وەك ئەوەی (ابن ابی لیلی)کردی و ئەبوحەنیفە لەو بارەیەوە دەڵێت: ((ئەوەی(ابن ابی لیلی)بەمنی کردووە، من بە ڕەوای نازانم بە گیانلەبەرانیشی بکەم)).

بینیمان چۆن پێشەوا ئەبوحەنیفە (رحمه الله) مەیل و دۆستایەتی عەلەویەکانی هەبوو، ئەمەشی نەشاردۆتەوە و لە هەڵقەکانیدا بەئاشکرا دەری بڕیوە، بینیشمان چۆن پێچەوانەی مەنسوریشی کردووە کە کاتێ داوای فەتوای لێ کردووە، هەروەها فەتواشی داوە بەوەی کە نابێت جیاکردنەوەی (إستثناء) نیاز لە سوێن لەیەك کاتدا نابن تا خەڵکی لای خەلیفە شتێك نەڵێن و دوای دوو ڕۆژ لێی پەشیمان بن.

هەرچەندە خەلیفە مەنسور زۆر نیگەران بوو لە هەڵسوکەوتی ئەبوحەنیفە، بە تایبەت دوای ئەوەی دڵنیابوو لەوەی کە مەیل و دۆستایەتی هەیە لەگەڵ نەوەکانی عەلی(خوا لێی ڕازی بێت)، کۆمەڵێ لە فەتواکانیشی ئەو ڕاستییە دووپات دەکاتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەرشتێکی وای بەدەستەوە نەبوو تا بەڵگە بێت لەسەر ئەوەی بۆی هەبێت بیگرێت، چونکە کارەکانی و قسەکانی لە هەڵقەکانی دەرنەدەچوو، هەروەك دینداریەکەشی خاوێن بوو هیچ لێڵییەکی تێدا نەبوو، هیچ کردەوەیەکی وا هەڵەشەی نەبوو تا لەسەری بگیرێت.

بەڵکو خەلیفە لەبەردەم پێشەوا و زانایەکی خواپەرست و متمانەدار و زیرەك و خێرۆمەندایە، کە ناو و شورەتی سنوری تێپەڕاندووە و لەهەموو هەرێمەکاندا بەڕێزەوە باسی زانایی و لێهاتووییەکەی دەکرێت.

هیچ بەهانەیەکی گرتنی پێ نەبوو، کە مادەم شمشێری دژی دەوڵەت هەڵنەبڕیوە و لەگەڵ هەڵگەڕاوەکاندا دەرنەچووە، تاکە هەلێك بۆ دەستگیرکردنی پێشەوا ئەوەبوو کە زۆری لێبکات تا قبوڵی بکات ببێتە قازی شاری بەغداد، دیارە ئەویش قەبووڵی ناکات.

جا ئەگەر هاتوو قەبووڵی قازی قازیەکانی کرد ئەوە نیشانەی دڵسۆزی و وەفاداری و گوێڕایەڵییەتی بۆ خەلیفە، ئەگەر ڕەدیشی

بکاتەوە ئەوە بەڵگەیەکی چاکە بەدەست دەوڵەتەوە، تا لەسەر ئەوە بیگرێت و ئەشکەنجەی بدات و بەبێ ئەوەی موسوڵمانان نیگەران ببن و ئاژاوەیەکی لێ بەرپا بکەن، چونکە دەڵێ ئەو بەیعەتەکەی شکاندووە کە دەبێت لە خۆشی و ناخۆشیدا گوێڕایەڵی ئەمیری باوەڕداران بێت. جا دەستیش بکاتە زیندانیکردنی و ئەشکەنجەدانیشی تا ناچاری دەکات ڕازی بێت بە وەرگرتنی پۆستی (وەزیری داد) بە زاراوەی ئەمڕۆ، ئەوەش دەکات گوایە لەبەر ئەوەی کە موسوڵمانان لە زانست و زیرەکی ئەبوحەنیفەی قازی بێ بەش نەبن و هەست نەکەن کە ئەمە حیلەیە و تەڵەی بۆ ئەنێنەوە بۆ لابردنی وەك بەربەستێك لەبەردەم حکومەتەکەیاندا.

یان مەگەر ئەو فەتواکانیان بە هەڵە و نامەقی نازانێت، مەگەر ئەو ناڵێ قازیەکانی حکومەت بە نەشارەزایی حوکم بەسەر خەڵکدا دەکەن. دەی کەواتە دەبێ خۆی بێتە پێشەوە و پۆستی قازی یەکەم وەربگرێت و نەهێڵێت هەڵە و ناتەواوی لە کاری دادگاکاندا بەرپا ببێت، قازیەکان ڕاست بکاتەوە و زوڵم نەهێڵێت. ئەی هەموو خەڵکی عێراق بە زانای پلەیەکی نازانن دەی کەواتە دەبێ زۆری لێ بکرێت، بۆ قەبوڵکردنی ئەرەی ببێتە گەورەی قازیەکان و لەبەر بەرژەوەندی گشتی پێویستە زۆری لێ بکرێت.

## پێشەوا پۆستی باڵا ڕەد دەکاتەوە

(ابو جعفر)ی مەنسور، پێشەوا (ابو حنیفە) (رحمە اللە) بانگ دەکات تا کاری قەزاوەتی بداتە دەست، بەڵام ئەو ملە جەڕێی کرد و وتی: هەرگیز وەری ناگرم.

دووبارە پێی وت: باشە ئەوە ناکەیت، دەی دەتکەینە سەرچاوەی قەزاوەت و هەموو قازیەکان چیان لێگیرا بگەڕێنەوە بۆ لای تۆ و تۆش بۆیان چارەسەر بکەیت.

مەنسوریش تورە بوو هەموو جۆرە سزایەکی قورس و لێدانی خستەکار لەگەڵیدا. لە(مناقب)ی (موفق المکی)دا هاتووە: کاتێك ئەبوحەنیفە لە بەغداد دەرچوو بەرەو کوفە گەڕایەوە، دەم و چاوی ئەدرەوشایەوە و دەیوت: (ئەم مەنسورە بانگی کردم تا بمکاتە قازی، منیش پێم وت: من بۆ قەزاوەت ناشێم بڵێ دەزانم شکاتکەر دەبێ شایەت بێنێ و شکات شکات لێکراویش سوێند بخوات، بەڵام هەموو کەس بۆ قەزاوەت ناشێت، کەسێ نەبێت کە بتوانێت دەستی بڕوات بەسەر تۆ و کوڕەکەت و سەرکردەکانت، منیش ئەو توانایەم نییە).

مەنسور وتی: ئەی خەڵاتەکانم بۆ لێ وەرناگریت؟

پێشەوا وتی: ئەمیری باوەڕداران لە پارەی گیرفانی خۆی بۆی نەناردووم و وەرینەگرم، من لەوە وەردەگرم، بەڵام پارەی بیت المال

مافی منی پێوە نییە و بۆ من حەڵاڵ نییە. من نە جەنگاوەرم، نە هەژارم، نە ویلدانم تا مافم هەبێ لەو پارەیەی دەوڵەتدا، لە کتێبی (المناقب)ی (ابن بزازی)دا هاتووە دەڵێت: ((ئەبو جەعفەر پێشەوا ئەبوحەنیفەی زیندانی کرد لەسەر ئەوەی ئەبێت ڕازی بێت بیکاتە قازی و ببێتە قازی قارییەکان، ئەویش ڕەدی کردەوە، ئەوانیش(١١٠) قەمچیان لێدا، لە زیندادن هێنایانە دەرەوە لەبەر دەرگا دایان نیشاند و داوایان لێ کرد هەر شتێکی لێ داوا دەکرێت فەتوای بۆ دەربکات و بەنامە حوکمە شەرعی و پرسیارە شەرعییەکانی بۆ دەهات، ئەویش بەهیچ شێوەیەك فەتوای نەدەدا، فەرمان درا بیگەڕێننەوە بۆ زیندان و ئەم جارە زیاتر ناڕەحەتیان کرد زۆر بە توندی ئەشکەنجەیان ئەدا)).

لە(تأريخ بغداد)دا هاتووە: ((ئەبو جەعفەر کە ئەبوحەنیفەی بینی ویستی بیکات بە قازی و ئەویش قەبووڵی نەکرد، خەلیفە سوێندی خوارد دەبێ بیکەیت، ئەبوحەنیفەیش سوێندی خوارد کە نایکەم، دووبارە مەنسور سوێندی خوارد دەبێ بیکەیت، ئەویش سوێندی خوارد کە نایکەم، تا(ربيع الحاصب)وتی: ئەوە نابینی ئەمیری باوەڕداران سوێند دەخوات؟ پێشەوایش وتی: ئاخر ئەمیری باوەڕداران وەزعی باشترە لەمن بۆ کەفارەتەکەی و هەرگیز نایکەم، ئەویش فەرمانی دا بردیان بۆ زیندان)).

هەروەها لە(ربیع)ی کوڕی(یونس)ەوە هاتووە دەڵێ: ئەمیری باوەڕدارانم بینی لەگەڵ ئەبوحەنیفەدا لەسەر مەسەلەی وەرگرتنی قەزاوەت دەمەقاڵەیان بوو، ئەو ئەیوت بە ئەبو جەعفەر: لەخوا بترسە، ئەو سپاردەیە مەدە بەکەس جگە لە کەسێ لەخوا بترسێت، سوێند بەخوا من لەکاتی ڕەزامەندیشدا لەخۆم ڕازی نیم چ جای لەکاتی توڕەبووندا، دڵنیابە ئەگەر سەربەستم بکەیت لەنێوان وەرگرتنی قەزاوەت و نێوان خنکاندن لە ڕووباری فوڕات دا، بێگومان خنکاندنەکەم هەڵدەبژارد، تۆ کەسانێکی زۆرت بە دەوردایە و پێویستە ڕێزیان لێ بگریت، من بۆ ئەو کارە ناشێم، ئەبو جەعفەریش پێی وت: درۆ ئەکەیت، تۆ شایستەی ئەو کارەیت، ئەبوحەنیفەیش وتی: دەی خۆت حوکمت دا بەسەرمدا، چۆن دەبێت کەسێك بکەیتە بەرپرسی قەزاوەت کە درۆزن بێت[31].

کۆی ئەم وتانە کە جیاجیان لە یەك بەڵام پێکەوە چەن مانایەك دەگەیەنێت لەوانە:

یەکەم: پێشەوا ئەبوحەنیفە ڕەدی ئەکردەوە پۆستی قەزاوەت وەربگرێت، تەنها بۆ ئەوە نەبوو کە ئامادە نەبووە بەشداری حکومەتەکەی مەنسور بکات، بەڵکو لەبەر ئەوەش بووە کە کارەکە

---

[31] تاريخ بغداد ب١٣ ل٣٢٩،٣٣٧.

زۆر ترسناکە و لەوانەیە هەر پێی نەوێرا بێت، ئەترسا ویژدانی دەرهاوێشتەکانی قەبوڵ نەکات، یان نەتوانێ نەفسی خۆی جڵەوگیر بکات لەو دەرەنجامانەی لە وەرگرتنی ئەو پۆستەدا ڕوویدەدا، لەوانەیە نەیتوانیبێت یاسای شەرع بەسەر هەموو کەسدا جێبەجێ بکات، ئەو ئەیزانی قەزاوەت زۆر ناڕەحەتە و هیچ سزا و ناڕەحەتییەکی پێ ناگات، ئێمە تەواو لەوە دڵنیاین کە تەنها لەبەر ئەوە خۆی لێ نەداوە، لەم ڕەدکردنەوەیەشدا هیچ مانایەکی سیاسی لەپشتەوە نییە هەرچەندە فەتوادانیشی بۆ نەدەکردن، لەو مەسەلانەدا کە قازیەکان سەری لەبەر دەرناکەن، ئەویش پێم وایە لەبەر ئەوە فەتوای نەداوە بۆ دەسەڵات، چونکە فەتوادانیش لە مەسەلە دادوەریەکاندا جۆرێکە لە قەزاوەت و چوونە ناو حکومەت.

دووەم: (ئەبو جەعفەر) گومانی ئەبرد کە پێشەوا تەنها لەبەر خۆدزینەوە لە حوکم و بەرپرسیارێتی ئەوە دەکات، چونکە بە دوایشیا لێی دەپرسی ئەی پارە و خەڵاتەکانمان بۆ ڕەد ئەکەیتەوە؟ چونکە حاشیە و چواردەورەکەی خەلیفە ڕۆڵیان هەبوو لە دروستکردنی گومان لە دڵی مەنسوردا، ئەگینا ئەویش خۆی بە مەسەلەکەی ئەزانی بەڵام وەك بڵێی خۆی لێ بێ ئاگا ئەکرد.

سێیەم:

پێشەوا (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) نەرم نەبووە لە وەڵامەکانیدا و وشەی هەنگوینی بەکار نەئەهێنا، حیلەشەرعی نەئەدۆزیەوە بۆ خۆدزینەوە لە وەڵامەکان، هەقی بە ئاشکرا دەردەبڕی و نە ئەترسا لە ئاکامەکەی، بەڵکو چاوەڕوانی سزایشی دەکرد و ئارامگری و خۆڕاگری دەروونی بۆ ئامادە دەکرد، ئەو قەزاوەتی ڕەد ئەکردەوە و فەتواشی بۆ نەئەدان و حیلەی نە ئەدۆزیەوە بۆ دەرباز بوون، بەئاشکرا ئەیوت بەخششم پێ حەڵاڵ نییە لە(بیت المال)ی موسوڵمانان، لەگەڵ سوێندی خەلیفەدا ئەمیش سوێندی دەخوارد و گوێی پێ نەئەدا، (ڕەبیع)یش قسەی خۆی دەکرد بەڵام گوێشی بەو نەداوە، چونکە ئەیزانی لەسەر ڕێگا ڕاستەکەیە و چاوەڕوانی پاداشتیش بوو، تا کۆتایی بەردەوام دەبوو و پاداشتیش لای پەروەردگارە.

* * *

# کۆچی دوایی پێشەوا

لەکۆتایدا نەهامەتی هات بەسەر پێشەوادا (رحمه الله) هەموو ڕیوایەتەکان لەسەر ئەوەن لە زیندانی کرا، دوای ئەوە ئیتر هەڵقەی وانەکانی نەما و فەتوایشی نەدەدا، چونکە لەم ناڕەحەتی و نەهامەتییەیدا کۆچی دوایی کرد.

هەرچەندە ڕیوایەتەکان هەمەجۆرن، هەندێ دەڵێن لە زینداندا و لەژێر ئەشکەنجەدا گیانی سپارد، چونکە بەتەمەن بوو خۆی نەگرت لەژێر ئازار و ئەشکەنجەدا. هەندێ تر دەڵێن: لە زیندان ئازاد کرا و گەڕایەوە بۆ کوفە و لەدوای(١٥) ڕۆژ کۆچی دوایی کرد.

هەندێ دەڵێن: ژەهری بۆ کراوەتە ناو ئاو تا مردنەکەی خێراتر بێت و ڕزگاریان بێت لەم بەربەستەیان. ئەوەی کە زۆر جێی باوەڕەو لەگەڵ پێگەی خەلیفەیشدا دەگونجێت ئەوەیە کە (ابن بزازی) لە (المناقب)دا هێناویەتی: کە دوای ئەوەی پێشەوا دەگیرێت و دەخرێتە ژێر ئەشکەنجە و ئازارەوە، وەزعی تەندروستی بەرەو خراپتر دەچێت، هەندێ لە کەسە نزیکەکانی مەنسور داوای لێ دەکەن کە ئازادی بکات، ئەویش لە زیندان ئازادی دەکات و دەینێرێتەوە ماڵەوە، بەڵام هەڵقەی وانە و فەتوادانی لێ قەدەغە

دەكرێت و نابێت لەماڵ بچێتە دەرەوە و لەگەڵ خەڵكی دابنیشیٚ، ئەویش بەو حاڵەوە بەردەوام بوو تا گیانی بەخوای خۆی سپارد[٣٢].

ئێمەش هەر ئەم رایەی كۆتایی بەڕاست و دروست ئەزانین، چونكە لەگەڵ ڕووداوە مێژووییەكاندا دەگونجێت، چونكە مەنسور نەیویستووە وەك كەسێكی ستەمكار و دژ بە زانست و زانایان دەربكەوێت، خۆ ئەگەر ڕووداو گەلێك ناچاری كردبێت كە سزا و ئەشكەنجەی پێشەوا ئەبوحەنیفە بدات و بەهانەی بەدەستەوە بوو، ژیریش لەگەڵ ئەم بەهانانەدایە كە زۆری لیٚ دەكرد قەزاوەت وەرگرێت نەك لەپێناو تۆڵەكردنەوە لێی، بەڵكو بە ئاشكرا و ڕوونی بۆ وەرگرتنی پۆست بوو، سەرەنجامێكیشی نەبوو.

ڕۆیش نەچوو لەسەر داواكاریەكەی تا نیەتی تری ئاشكرا نەبێت، كە ئاقڵانەش لەوەدا بوو كە لەناو كەسە نزیكەكانی خەلیفەدا ئەوەبوو تكایان لێكرد كە ئازادی بكات و هیچ زیانێكیشی بۆ خەلیفە نەبووە.

لەلایەكی تریشەوە خەلیفە ئەبیٚ حسابێك بۆ ڕای گشتی بكات، لە سزادانی پێشەوایەكی ئاوا گەورەدا ڕۆنەچێت، هەموو ڕاویەكانیش لەسەر ئەوەن كە وەسیەتی كردووە لەو لایەنەی گۆڕستانەكەوە

---

[٣٢] المناقب لابن البزازي ب ٢ لا ١٥ و دواتر..

بمنێژن کە داگیر نەکراوە، چونکە ئەوبەری داگیرکراوە، ئەم وەسیەتەش هەمووان ئەزانن کاتێك بووە لەدەرەوەی زیندان بووە.

قەدەغەکردنی لە وانە وتنەوە و فەتوادان بەسە کە خەلیفە دڵنیابێت پێشەوا ئیتر مەترسی نییە لەسەر دادوەر و حکومەتەکەی، کەواتە مانای نییە بەردەوام لە زینداندا بهێڵرێتەوە، ئەگێڕنەوە مەنسور نوێژی لەسەر کردووە و ئەگەر لە زینداندا بمردایە نوێژی لەسەر نەدەکرد.

بەڵێ پێشەوا ئەبوحەنیفە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) وەك ڕاستگۆیان و شەهیدەکان گیانی بەخوای خۆی سپارد، لە ڕیوایەتی ڕاست و دروستدا ساڵی(١٥٠)ی کۆچی لە دونیا دەرچووە.

بەڕاستی مردن حەوانەوە بوو، بۆ ئەو ویژدانە زیندووە و بۆ ئەو ویژدانە ئاینییە هەڵچووە و ئەو دڵە بەهێزە و ئەو ژیری لەڕادە بەدەرە، ئەو دەروونە بە ئارامەی کە لەسەر هەموو سزا و ناڕەحەتییەك خۆی گرت، کە لەلایەن نەیارانەوە دەیبیست و هەموو جۆرە تیرێکی تێگیرا و بە ئارامی و ڕەزامەندییەوە بەرەو ڕووی بوویەوە، تەنانەت لە زاناکانیشەوە دووچاری دەبوویەوە، لە ئەمیرەکان و خەلیفەکانیشەوە لەناو ئازار دەتلایەوە. بەڵام نە لاواز بوو، نە ترسایش، ئەگەر دەروونەکانیش جیهادی خۆیانیان هەبێت، پێشەوایش گەورەترین پاڵەوانی مەیدانی ئەو جیهادە بوو و هەردەم

سەرکەوتوو بووە، تەنانەت لەسەرەمەرگیشدا هەر خەمی حەڵاڵ و حەرامی بووە و وەسیەتی کردووە لە زەویەکی وادا بنێژرێت کە داگیر نەکرابێت، لەلایەن ئەمیرەوە دەستی بەسەردا نەگیرابێت، تا ئەبو جەعفەر کە هەواڵەکەی بیست وتی: بە زیندوویی و مردویش هەر لە رێگەمدایە.

بەڕاستی سەروەربوونی زانست و ئاین و ڕۆح کاریگەریەکی وایان هەیە لەسەر خەڵکی، کە هیچی کەمتر نییە لە دەسەڵات و پادشایان، بۆیە هەموو بەغداد ئەو ڕۆژە لەگەڵ جەنازەکەیدا ڕۆشتن بۆسەر قەبران، ئەمەش هەروا ڕوونەداوە بەڵکو جیهانی ئیسلام زانای گەورەی عیراق و پێشەوای (اعظم)یان لەدەست داوە.

تەنانەت دەڵێن (٥٠) هەزار کەس نوێژیان لەسەر کردووە و تەنانەت دوای ناشتنیشی ئەبو جەعفەر خۆیشی چووە نوێژی لەسەر گۆڕەکەی کردووە، ئیتر نازانین ئەو کارەی دانَنان بوو بە گەورەیی و عەزەمەتی ئەو زانا هەق بێژەدا یان لەبەر ڕازی کردنی خەڵکی؟!

لەوانەیە لەبەر هەردوو هۆکارەکە بووبێت چونکە پێشەوا بەڕاستی مەزن بووە.

پێشەوا (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لەشاری بەغداد و لەو گەڕەکەی ئێستا پێی دەڵێن (اعظمیة) بەخاك سپێردرا، نەشبیستراوە کە هەرگیز هەڵقەی وانەکانی گوێزابێتەوە بۆ بەغداد و

هەر لە کوفە ماوەتەوە، بەڵام پێشەوا ئەوساڵانەی لە مەککە خۆی حەشاردابوو هەڵقەی وانەی هەبوو، گفتوگۆ و بەرامبەرکێی لەگەڵ زاناکاندا هەبووە لە مەسەلە فیقهیەکاندا.

زانای کوفە، لە مەککە چەندان جار لەگەڵ ئەوزاعی ڕای فیقهیان تاوتوێ کردووە و لەگەڵ پێشەوا مالیکدا وانەی وتۆتەوە پێی و سوودی پێ گەیاندووە، بەڵام وانەی سەرەکی و ژیانی خۆیشی هەر لە کوفە بووە تا بە (زانای کوفە)ناوبانگی دەرکردووە.

*** 

## زانستی پێشەوا ئەبوحەنیفە و سەرچاوەکانی

لە هەموو مێژووی فیقهی ئیسلامدا زانایەك شك نابەین بە وێنەی ئەبوحەنیفە پیاهەڵدان و ڕەخنەگرانی زۆر بووبن، زۆر (زمان) درێژبوون بۆ ڕەخنە لێگرتنی و زۆر قەڵەمیش لە مەدح و پیاهەڵدانیدا کتێبیان نووسیوە. چونکە پێشەوا خۆی خاوەنی ڕێبازێکی فیقهی سەربەخۆ بوو، زۆر قوڵیش ڕۆچوو بوو لەو بوارەدا، دەی ئاساییە کە کەسانێك هەبن لە دژی بوەستنەوە و کەسانێکیش هەبن هاوسۆز و شوێنکەوتەی بن.

زۆربەی ئەوانەی دژایەتیان کردووە ئەوانە بوون کە توانای ڕوبەڕوبونەوەیان نەبووە لەگەڵ بیروڕا سەربەخۆکانی یان نەگەشتوونەتە ئاستی بەرزی ئەو، یان ئەو کەسە وەستاوانەی کە قبوڵیان نەبووە جگە لە بیروبۆچوون و وتەی سەلەف کەس شتێکی سەربەخۆ و نوێ بڵێت و بە بیدعەیەکی خراپ ناویان بردووە.

ئەوان ئەیان وت لە سنور بەدەر بەڕای خۆی قسەی کردووە، کە لە نەزەری ئەواندا ئەبوایە یان قسەیان نەکردایە یان زۆر بە کەمی.

یان هەندێکیش بە نەزانین دژایەتیان کردووە و ڕاستی خواناسی و تەقوا و پیاوەتی و فەزلە زۆرەکەی پەروەردگاریان نەدیوە بەسەریەوە، کە خاوەنی ژیرییەکی لە سنور بەدەر و زانستێکی

فراوان، ڕێزێکی گەورە و گران بووە لەلای خەڵکە عامەکە و زانا و کاربەدەستانیش .

هەرچۆنێ ڕەخنەگرەکانی جیاجیابوون، قسەی زۆر لە دژی کردووە و درۆی زۆریان بەدەمەوە هەڵبەستووە، تەنانەت لە ژیانیشدا و دوای مردنیشی. ئیتر ژیان وایە ئەو کەسانەی کە زانا و زیرەك و لێهاتوو، بەرهەمدارن، دوژمن و ناحەز و داخ لەدڵیان زیاترە لەوانەی کە وەك ئەوان نین.

**وتەی زاناکان دەربارەی ئیمام ئەبوحەنیفە:**

فەرموون، با وتەی هەندێ لەو زانا گەورە و ناودارانەی سەردەمەکەی خۆی و دوای خۆیشی بهێنین و بزانین چ گەوهەرێکی گران بەها بووە زانای کوفە و فەقیهی عیراق.

*(فضیل)ی کوڕی(عیاض)کە بە حەڵاڵخۆر-الورع- ناوی دەرکردبوو دەربارەی پێشەوا ئەبوحەنیفە (خوا لێی ڕازی بێت)دەڵێ:

(( ئەبوحەنیفە پیاوێکی زانای فیقهی بووە و بە فیقهـ ناوی دەرکردووە، پارەداریش بووە و بەخشندە بووە بۆ چواردەورەکەی، بەئارام بووە لەسەر عیلم و زانستی شەو و ڕۆژی، ڕەوشت بەرز بووە، زۆر بێ دەنگ بووە، زۆر کەم قسەی کردووە مەگەر کاتێك حەڵاڵ و

حەرام هاتبێتە ئاراوە، زۆر بەجوانی ڕێگای ڕاستی ئەدۆزییەوە و زۆر لە سامان و پارەی دەسەڵاتداران ترساوە))[٣٣].

*(جعفر)ی کوڕی(ربیع)یش دەڵێت: ((پێنج ساڵ لە خزمەت ئەبوحەنیفەدا بووم، کەسم نەدیوە وێنەی ئەو بێ دەنگ بێت، بەڵام کە مەسەلەیەکی فیقهی دەهاتە پێشەوە ڕووی دەگەشایەوە و وەك ئاوی دۆڵ دەهاتە خوارەوە، دەنگێکی گەورە و ئاشکرای پێوەبوو))[٣٤].

*(ملیح)ی کوڕی(وکیع)کە هاوچەرخی پێشەوا بوو دەڵێت: ((سوێند بەخوا ئەبوحەنیفە ئەمانەت پارێزێکی گەورە بوو، سوێند بەخوا خاوەنی دڵێکی گەورە و ڕێزدار بوو، خەمی ڕەزامەندی خوای بووە و بەس، ئیتر با لەپێناو خوادا شمشێریش بدرێت لە گەردنی، ڕەحمەتی خوای لێ بێت خوا لەگەڵ چاکەکاراندا لێی ڕازی ببێت)).

*(عبدالله)ی کوڕی(مبارك) حەلاڵ خۆری لەخواترسی هاوچەرخی دەڵێت: ((ئەبوحەنیفە مۆخی زانست بوو))[٣٥].

*زانای فەرموودەناس(ابن جریج)لە سەرەتای ژیانیدا بینی پێی وت:((ئەم لاوە لە زانستدا زۆر عەجیب و سەرسوڕهێنەری لێ

---

[٣٣] تأریخ بغداد ب١٣ لا٣٤٠.

[٣٤] تأریخ بغداد ب١٣ لا٣٤٠.

[٣٥] الخیرات الحسان لا٣٣.

دەردەچێت))و لە گەورەیشدا پێی وت: ((بەڕاستی فیقهزانە، فیقزانە))

*هەندێ لە هاوچەرخەکانیشی دەربارەی ئەبوحەنیفە وتوویانە: ((ئەبوحەنیفە زانایەکی عەجایەب بووە لە عەجایەبەکان، کەس لە وتەی ئەو خۆی لا نەدەدا مەگەر ئەوانەی کە توانایان بەسەریدا نە دەشکا))[٣٦].

*لە(الأعمش)یان پرسی سەبارەت بە ئەبوحەنیفە لە وەڵامدا وتی:((فقهزان بوو، بەڕاستی))

*لە مالیکەوە ئەگێڕنەوە کە (عثمان البتی) پرسیاری ئەبوحەنیفەی لێ کرا وتی: ((بەڕاستی نزیککەرەوە بوو))

*(ابن شبرمە)یش دەڵێ: بەڕاستی نزیك کەرەوە بوو. پرسیاری دەربارەی ئەبوحەنیفە لێکرا وتی: ((ئەگەر ئاڵتونەکانتانی بهێنایە و لەگەڵ تەختە قیاسی بکردایە، گومانتان ئەبرد کە ئاڵتونەکانتان تەختەیە))[٣٧].

ناتوانین هەموو ئەو وتانە بهێنین کە لەبارەی چاکی و زانایی پێشەوا ئەبوحەنیفەوە نووسراوە و وتراوە و ئەمەی هێنامان مشتێك

---

[٣٦] الانتقاء لابن عبدالبر لا٢١٣.

[٣٧] الخیرات الحسان لا٢٥.

نمونەی خەروارێکە. هەموو لایەنگرانی و نەیارانیشی دانیان بەوەدا ناوە کە بەڕاستی فەقیهـ بووە.

جوانترین وتەیەك سەبارەت بەو پیاوە وترابێت وتەکەی عبداللهی کوڕی موبارەکە ڕەحمەتی خوای لیٚ بێت کە فەرموویەتی: ((کان ابو حنیفه مخ العلم)). بەڕاستی وابووە گەشتۆتە ناوکرۆك و ناوجەرگەی زانست و ناوئاخنی مەسەلەکانی تاوتویٚ دەکرد و بنەڕەتەکەی ئەدۆزیەوە و حوکمی لەسەر بینا دەکرد.

ئەم زانایە لە هەموو بوارەکانی زانستدا بەتوانا بووە، ئەوەتا لە مەسەلە ئیمانییەکاندا گفتوگۆی لەگەڵ ئەهلی هەواوئارەزووەکاندا کردووە و زۆرێکیانی هێناوەتە سەر ڕاستە ڕیٚ و لەو بوارەشدا کتێب و نووسراو هەیە کە دەڵێن ئەو نووسیویەتی.

لە زانستی فەرموودەشدا کۆمەڵیٚ مەسنەد ئەدەنە پاڵی و بەم سەنەدانەش ئەو پیاوە دەڕواتە ڕێزی فەرموودەزانان (المحدثین)، هەروەك مەقامێکی بەرزی هەبووە لە زانستی فیقهیدا و دەرهێنانی فەرموودە و هەڵگۆزینی حوکمی شەرعی لە تایبەتمەندییەکانی ئەو بووە. تەنانەت هەندیٚ لە هاوچەرخەکانی دەیانوت: ((کەس نییە ئەوەندەی ئەبوحەنیفە لە مانا و مەبەستی فەرموودەکان تیٚ بگات. ئەمەش بەهۆی ئەوەوە بووە کە هۆکارەکان کە وایان کردووە فەرمودەکە ئەو حوکمە دەرکات، بەجوانی ئەیدۆزیەوە لەتار

وشەکان و هۆکارەکانی پشت پەردە، چونکە ئەو هەرگیز کاری بە زاهیری فەرموودە نەکردووە و بەس، بەڵکو لەگەڵ ئەوەشدا بۆ ماناکەی ئەگەڕا و هۆکاری حوکمەکەی ئەدۆزیەوە و پەیوەستی ئەکرد بە مەسائیل گەلێکی ترەوە و چەندان مەسەلەی فیقهی نوێی پێ چارەسەر دەکرد، کە لە خولگەی لەیەکچوونی حوکمەکانیاندا ئەخولایەوە.

باشە دەبێ ئەو زانا مەزنە، ئەم هەموو زانستەی لە چ سەرچاوەیەکەوە وەرگرتبێت؟ چ هۆکارێك بوونە هۆی ئەوەی وەك ڕاویەکان دەڵێن چوو بووە ناو کرۆکی زانستی ئیسلامییەوە.

چوار هۆکار هەیە کە وا دەکات لەو کەسانەی خەریکی زانستن کە هەڵکەوتەی سەردەمی خۆیان دەربچن و ئاڕاستەیەکی دروستی زانستی وەربگرن:

یەکەم: هەندێ ڕەوشت و ئاکاری سروشتی–خواکرد–کە لە پێشەوادا ڕیشەی داکوتابوو، کە حەز و ئارەزووە بڵندەکانی و دەستکەوتە فیکرییەکانی دەردەخات.

دووەم: ئەوانەی پێشەوا دیونی و ئاڕاستەیان کردووە و کاریگەریان هەبووە لەسەری و ئەو ڕێچکەیەیان بۆ دیاری کرد کە دەبێت بیگرێتەبەر، یان پرۆگرامی جیاجیایان پێ پیشان داوە و

لەژێر ڕۆشنایی هەموو ئەوانەدا ڕێگای بڕیوە و ئەو ڕێگایانەی بەکارهێناوە کە بەڕاستی و نموونەیی زانیوە.

سێ یەم: ژیانی تایبەتی خۆی و تاقیکردنەوەکانی ژیانی و ئەو نەهامەتیانە و ئەو ڕێڕەوانەی کە پێی گەیشت، چونکە بەهرەکان و مامۆستاکان یەك دەگرن لە دوو کەسایەتیدا، بەڵام یەکەمیان بەرەو سەرکەوتن دەیبات و ئەوی تریان سەرکەوتن بەدەست ناهێنێت. یان ئەوەیە ئەو ڕێگایانە دەگرێتەبەر کە نایگەیەنێتە سەرکەوتن. چونکە ژیانە تایبەتەکەی خۆی نەخشە ڕێگایەکی تری بۆ کێشاوە، جۆرە گونجانێك ڕووی نەئەدا لەنێوان ئاڕاستەکردنی لەلایەن مامۆستاکانیەوە و بەهرەکانی، ئەو ئاڕاستانەی ژیانی تایبەتی خۆی ئەیکێشا و ئەو شتانەی هاتنە ڕێگەی.

چوارەم: ئەو سەردەمەی تیا ژیاوە، ئەو کەسە فیکریەی کە تیایدا گوزەراندویەتی و بەهرەکانی تێدا گەشەی کرد لەژێر سایەیدا.

فەرموون با لەسەر ئەم چوار خاڵە بە وشەیەك درێژەی پێ بدەین..

***

# ڕەوشتەکانی پێشەوا ئەبوحەنیفە

چەند ڕەوشتێك لە پێشەوا ئەبوحەنیفەدا بونیان هەبوو کەوای لێبکات لە چڵەپۆپەی زاناکاندا بێت، کە وەسف کراوە بە وەسفی زانایەکی هەق، زیرەك، متمانەدار، دووربین لە بیرکردنەوەدا، هەنگاوی بەرەو ڕاستییەکان، خێرا وەڵام و خێرا ئەفکاری بۆ بێت.

١/ پێشەوا(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) زەبت و ڕەبتی خۆی هەبووە: دەستی گرتبوو بەسەر هەستەکانی خۆیدا و قسەی لابەلایی ئەم و ئەو تێکی نەدات، وشە ناشیرینەکان نەیانتوانیوە لەهەق دووری بخەنەوە، جارێکیان لە مەسەلەیەکدا گفتوگۆی دەکرد کە ئامۆژگاری عێراق –حسن البصری– قسەی تێدا کردبوو وتی: حەسەنی بەسری بە هەڵەداچووە لەو مەسەلەیەدا، لەوێدا پیاوێك تووڕە بوو وتی: بێ ئەدەبانە وتی: هەی دایك–هێن– چۆن دەڵێی حەسەن بەهەڵەدا چووە.

پێشەواڕەحمەتی خوای لێ بێت ڕەنگی تێکنەچوو، سوور هەڵنەگەڕا و لەسەرخۆ وتی: سوێند بەخوا حەسەنی بەسری بەهەڵەدا چووە و عبداللەی کوڕی مەسعود پێکاویەتی و پاشان وتی: هەمیشە

دەیوت: ((خوایە هەر کەسێ ئێمە ناچینە دڵییەوە، دڵی ئێمە بۆ ئەو کراوەیە))[38].

ئەم سنگ فراوانی و نەرم و نیانییەی پێشەوا لە کەسێکەوە دەرنەچووە بێ هەست و هەست لاواز، بەڵکو خاوەنی دڵێکی هەستیار، بەهەست. دەگێڕنەوە لە یەکێ لە گفتوگۆکاندا کەسێ پێی وت: ئەی بیدعەچی ئەی بێ دین-زندیق. ئەویش لەوەڵامدا وتی: خوا لێت خۆش بێت، خوا ئاگادارە من بەپێچەوانەی قسەکەی تۆوەم، من لەوەتی ناسیومە لەڕێبازەکەی لام نەداوە، هیچ هیوایەکیشم نییە جگە لە لێبوردنی خوایی و جگە لە ترسی سزای خوا هیچ ترسێکی تر نییە لە دڵما، کە ناوی-سزای برد-دەستی کرد بەگریان.

پیاوەکەش وتی: گەردنم ئازاد کەلەسەر ئەوەی وتم، پێشەوایش وتی: هەر کەسێ بەنەفامی قسەم پێ بڵێ ئەوە گەردنی خۆش و ئازادبێ، بەڵام هەرکەسێ لە زاناکان بەجۆرێ باسم بکات، ئەوە لە کێشەدایە چونکە غەیبەتی زانایان لەدوای خۆشیان دەمێنێتەوە[39].

خۆ لەسەرخۆیی و نەرم و نیانیەکەی پێشەوا لە بێ هەستییەوە نەبوو، بەڵکو ئارامی و نەفس بەرزی و تەقواداری بوو، کە هەست بەهیچ شتێك ناکات کە پەیوەندی بە خواوە نەبێت، چلك و چێواری

---

[38] تأریخ بغداد ب۱۳ ل۳۵۲.

[39] المناقب للمکی ب۲ ل۲٦۸.

خەڵکی پێوە نەنووسابێت، وەك بڵێی لاپەڕەیەکی سپی جوان و لوس، هیچ قسە و جنێوێکی خەڵکی پێوە نانووسێت، بەڵکو لێی ئەوەرێتە خوارەوە و هیچی لەو شتانە پێوە نانووسێت.

بەڵکو نەرم و نیانییەکەی، هی کەسێکە جڵەوی خۆی دەگرێت و بە ئارامییەوە خۆی دەگرێت و فیکر و هۆشی ناداتە بەر توندە بای ئازاردەری دەروونەکان. پیاوێکی دڵقایم و خۆگربوو.

ئەگێڕنەوە لە کاتی وانە وتنەوەیدا، مارێك لە سەقفەکەوە ئەکەوێتە خوارەوە و ئەکەوێتە باوەشی پێشەوا ئەبوحەنیفە، هەموو خوێندکارەکانی ڕایان کرد و بڵاوەیان لێ کرد تەنها پێشەوا نەبێت کە هیچ خۆی تێك نەدا و بە ئەسپایی لای برد لە باوەشی[٤٠].

ب. سەربەخۆ بڕیاردانی پێ بەخشرا بوو؛ بەجۆرێ بوو لە کەسدا نەئەتوایەوە، مامۆستاکەشی بە ئاشکرا ئەمەی تێدا بەدی کرد، لە هەموو مەسەلە فیقهییەکاندا تا دید و بۆچوونی خۆی تێدا بەکارنەهێنایە یەکسەر وەری نەئەگرت.

هەر ئەو سەربەخۆیی لە فیکر و بیرکردنەوەیدا وای لێکردبوو ئازادانە بیر بکاتەوە و نەچێتە ژێر هەژموونی هیچ بۆچونێك، ئەگەر بەڵگەی قورئان یان سوننەت یان وتەی هاوەڵانی لەسەر نەبووبێت.

---

[٤٠] الخيرات الحسان ٤٠٧ .

بەڵام کە کار گەشتە شوێنکەوتوان-التابعین- لە قسەکانیان وورد ئەبویەوە و هەڵە و ڕاستی دیاری ئەکردن، چونکە دەیوت ڕای ئەوان واجب نییە لاساییان بکەینەوە-التقلید- و شوێنکەوتنیشی لە وەرع و پەرستش نییە.

پێشەوا (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە ناوجەرگەی ناوچەی شیعەکاندا ژیاوە-کە کوفە- بوو، هەموو ئەو پێشەوایانەی سەردەمی خۆی بینیوە کەشیعەکان بە ئیمامی خۆیانی دەزانن، هەندێکیشیان مامۆستای بوون وەك: (زەیدی کوڕی عەلی) و (محمد الباقر) و (جعفر الصادق) و (عبدالله)ی کوڕی(حسن)،[41] لەگەڵ ئەوەشدا ڕای تایبەتی خۆی هەبووە لەسەر هاوەڵانی پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم)و ڕێزی تەواوی لێ گرتوون، کەچی لەولاشەوە مەیل و خۆشەویستی زۆری هەبوو خانەوادە و (ئال و بەیتی) پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) تەنانەت لەو پێناوەشدا زۆر ئەشکەنجە و سزا و زیندانیش کراوە.

تەنانەت (ابن عبدالبر) لە (الانتقاء)دا هێناویەتی کە: سەعیدی کوڕی ئەبی عروبە دەڵێ: هاتم بۆ کوفە و چووم بۆ هەڵقەی وانەکانی

[41] ئەم ئیمام و زانا گەورەرانە هیچیان بیروڕا و فکری شیعەیان نەبووە، بەم جۆرەی ئێستا باس دەکرێت لەناو شیعەکاندا، بەڵکو هەموویان ئەهلی سووننە و جەماعە بوون. (کتێبخانەی گەشە).

ئەبوحەنیفە، جارێکیان ناوی عثمانی کوڕی عەففانی برد (خوا لێی ڕازی بێت)و بەدوایدا وتی: ڕەحمەتی خوای لێ بێ، منیش پێم وت: تۆ ڕەحمەتت لێ بێ ڕەحمەت بۆ عثمان دەنێریت؟ لە کاتێکدا خەڵکی ئەم ناوچەیە کەسیان ڕەحمەتی بۆ نانێرن[٤٢].

ئا ئەمەیە بیر و هۆشی سەربەخۆ و بێ لایەن، کە نەچێتە ژێر هیچ کاریگەریەکەوە، خۆشەویستی و ڕق و کینە کاری تێ نەکات و ڕای پێ نەگۆڕێت.

ج. بیر و هۆشی قووڵ بووە: لە مەسەلەکاندا قووڵ بۆی ئەچوو، بەشتێکی ئاسایی و زاهیری وازی نە ئەهێنا، هەرگیز بە (ظاهر النص) کاری نەکردووە. بەڵکو سەیری مەبەست و هۆکار و حیکمەتەکانی دەکرد، هەر مەسەلەیەکی تاوتوێ بکردایە دەچووە بنج و بناوانی و لەسەر مانا ئاشکراکەی نەدەوەستا، بەڵکو هۆکارەکان و مەبەستەکانی بەلاوە گرنگتربووە.

لەوانەیە ئەو عەقڵە وورده، فەلسەفییە قووڵەی کە خوا پێی دابوو، بوو بەهۆی ئەوەی کە لە سەرەتای ژیانییەوە لە زانستی – کەلام–و گفتوگۆ لە مەسەلە ئیمانی و نادیارەکاندا خۆی ببینێتەوە. تا ئەو تەوژم و برسێتییە عەقڵییەی ڕازی بکات و ئەو لایەنە

---

[٤٢] الانتقاء ابن عبدالبر لا ١٣٠.

فیکرییەی خۆی تیژ بکات و لەو بوارەدا قسە بکات. لەوانەشە ئەو عەقڵەی بووبێت کە پاڵی پێوە ناوە تا دیراسەی ووردی فەرموودە بکات و لە هۆکار و ئەحکامەکانی تری لێ وەربگرێت، لەم کارەشیدا سوودی لە ئاماژەکانی وشەکان و مەبەستەکانیان وەرگرتووە و لە تێکەڵبوونی بارەکان و وەسفە گونجاوەکان، تا وای لێ دەکات هۆکارەکانی دەکەوتە بەردەست و دواتر(قیاسی) بەسەردا جێبەجێ دەکرد و گریمانەکانی لەسەر بونیات دەنا و وێنەکانی وێنە دەکرد، لەو بوارەشدا پلەیەکی بەرزی بڕی بوو.

د. هەمیشە وەڵام حازر بووە؛ لەکاتی پێویستدا مانای وشەکان یەك یەك بۆ دەهات. هەرگیز فیکری قوفڵ نەدەبوو و مەسەلەکانی لێ نە ئەگیرا و لە دەمەقاڵە و گفتوگۆکاندا دەمکوت نەدەکرا، کاتێك هەق لەلای ئەو بوایە و بەڵگەی بەدەستەوە بوایە، تەنانەت پێشەوا (لیث)ی کوڕی(سعد)دەڵێ: ئاواتم ئەوە بوو ڕۆژێك ئەبوحەنیفە ببینم، تا ڕۆژێ خەڵکێکی زۆر داباریبوون بەسەر زانایەکدا، پیاوێك وتی: ئەی ئەبوحەنیفە، چەن پرسیارێکی لێ کرد، سوێند بەخوا بە بەهێزی وەڵامەکانی ئەوەندەی خێرا وەڵام دانەوەکانی سەرسام نەبووم.

زۆر لێزان و فرە حیلە بووە، زانیویەتی لەکوێوە بۆی بڕوات تا بەرامبەرەکەی دەمکوت بکات و بێگومان بە ئاسانترین شێوە، لەو

بوارەشدا مەسائیلێکی زۆری لە سەرسامی نامۆ و شتی تری لێ دەگێڕنەوە، کە کتێبی ژیاننامە و کەسایەتییەکان و کتێبە مێژووییەکان باسی پێشەوا ئەبوحەنیفە یان کردووە، هەندێ لە میزکرد و گفتوگۆکانیتان بۆ دێنمەوە کە بەڵگەیە لەسەر نەرم و نیانی و جوان وەڵامدانەوەی پێشەوا لەوانە:

یەکەم:

ئەگێڕنەوە پیاوێك مرد و وەسیەتی کرد سامانەکەی بۆ ئەبوحەنیفە بێت و پێشەوایش لەو کاتەدا ئامادە نەبووە، دۆسیەکە بەرزکرایەوە بۆ لای قازی(ابن شبرمە)و باسەکەیان بۆ کرد و ئەبوحەنیفەیش شایەتی هێنا لەسەر ڕاستی وەسیەتەکە، (ابن شبرمە)یش لێی پرسی ئەی ئەبوحەنیفە سوێند ئەخۆی ئەم شایەتانە ڕاست ئەکەن ؟

ئەویش وتی: لەسەرم نییە سوێند بخۆم چونکە من لێرە نەبووم لەو کاتەدا. (ابن شبرمە)یش وتی: ئەم جارە قیاسەکانت نەپێکا، پێشەوایش هەر لەوێدا وتی: ئەی چی دەڵێی بۆ نابینایەك سەری بشکێت و دوو شایەت شایەتی بۆ بدەن کە فلان کەس سەری شکاند، دەی ئایا بۆ قازی هەیە بە پیاوە نابیناکە بڵێ سوێند بخۆ لەسەر ئەوەی شایەتەکانت ڕاستەکەن، (ابن شبرمە)یش سەری لەقاند و وەسیەتەکەی جێبەجێ کرد.

دووەم:

(ضحاکی کوڕی قەیس ی خارجی)کە لە سەردەمی ئەمەویەکاندا چەکی دژی خەلیفە هەڵگرت و خۆی کرد بە مزگەوتی کوفەدا وتی بە ئەبوحەنیفە: تەوبە بکە، پێشەوا فەرمووی: لە چ تاوانێك تەوبە بکەم؟ وتی: لەوەی تۆ قبوڵی حەکەم دانانت کردووە و بە دروستت زانیوە، پێشەوا وتی: بۆ کوشتنم هاتوویت یان بۆ گفتوگۆ؟ وتی: نا نا بەڵکو گفتوگۆت لەگەڵ دەکەم. پێشەوا پێی وت ئەی ئەگەر ناکۆکی کەوتە نێوانمان کێ بکەوێتە نێوان من و تۆوە؟ وتی: تۆ کێ دادەنێیت داینێ، پێشەوا ئەبوحەنیفە ڕووی کردە هاوڕێیەکی (ضحاك) و پێی وت تۆ حەکەم بە لە نێوانمان ئەگەر ناکۆکی کەوتە نێوانمان، پاشان ڕووی کردە (ضحاك)وتی: ڕازیت بەو حەکەمەی نێوانمان؟ (ضحاك)وتی: بەڵێ، ئەبوحەنیفە وتی: دەی کەواتە تۆیش دانت نا بە ڕەوایەتی(تەحکیم)دا و دەمەقوڵەکە گەشتە ئەنجام.

سێیەم:

دەڵێن لە کوفە پیاوێك هەبوو دەیوت: عثمان کوڕی عەففان جولەکە بووە، هیچ کام لە زاناکان نەیان توانی ئەم قەناعەتەی پێ بگۆڕن، ئەبوحەنیفە چوو بۆ لای و پێی وت: هاتووم کچەکەت داوا بکەم، وتی: کێ؟ وتی: بۆ پیاوێکی بەڕێزی دەوڵەمەند و قورئان خوێن، بە سەخاوەت، شەوەکان لە ڕکوعدایە و هەمیشە لە ترسی

پەروەردگار چاو بەگریانە، وتی: بە نیوەی ئەم وەسفانەش ڕازیم ئەی ئەبوحەنیفە.

پێشەوایش وتی: بەڵام یەك شتی تێدایە، وتی: چییە؟ وتی: جولەکەیە. پیاوەکە تورە بوو وتی: سبحان الله! !تۆ داوام لێ دەکەیت کچەکەم بدەم بە جولەکەیەك؟ وتی: جا واتە نایدەیت؟ وتی: نەخێر. دەی خۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)کچەکەی داوە بە جولەکەیەك –مەبەستی عثمانی کوڕی عەفان بوو– پیاوەکەش تێگەیشت و وتی: (استغفرالله) تەوبە پەشیمانم.

زۆر نووسراوە لەسەر ژیری و لێزانی و هونەری گفتوگۆکردن و هەڵبژاردنی جوانترین وشە لە ناڕەحەت ترین و دژوارترین کاتەکاندا، تا کار گەشتە ئەوەی کە ئەبو جەعفەر و پێی وتبوو (أنت صاحب حیل) واتە تۆ زۆر لێزان و فێڵ زانیت.

بەهۆی بەهێزی فیراسەت و توانای بینایی لە ڕادەبەدەرەکەیەوە گفتوگۆ و میزگرتن لەلای پێشەوا زۆر ئاسان بووە، لەو ڕێگایەوە توانیویەتی دڵە داخراوەکان بکاتەوە و شاراوەکانی ناو دەروونەکان ئاشکرا بکات، لە ڕێگایەوە بۆی ئەچوو کە ئەوان لێی حاڵی دەبوون و دواتر هەقی بۆ ڕۆشن دەکردنەوە.

هـ. پێشەوا ئەبوحەنیفە زۆر دڵسۆزانە هەق ویست بووە: کە ئەوەش ڕەوشتێکی گەورە و کەماڵە کە ئەبوحەنیفەی بەرزکردەوە و دڵی ڕووناك کردەوە و بینایی ڕۆشن کردەوە بۆ وەرگرتنی زانست و زانیاری. خوا نوری ڕووناکی زانیاری ئەخاتە ئەو جۆرە دڵانەوە و دواتر ڕێگای بۆ ڕۆشن دەبێتەوە و فیکری ڕاست دەبێتەوە.

چونکە گرتنەبەری ڕێڕەوی ڕاستەقینە لە دەستکەوتنی زانستدا دەبێتە هۆی ئاسان تێگەیشتن و پەی پێ بردنی، بەپێچەوانەی ئەو کەسانەی کە بەدوای ئارەزوو بازیدان، ئەوەش سەری لێ تێك دەدات و نازانێ ئایا خۆی لەناو لەناوچوونی ئارەزووەکانیدایە یان لەناو پەیبردن بە زانست.

پێشەوا ئەبوحەنیفە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) خۆی خاوێن کردبوویەوە لە هەموو ئارەزوو پەرستیەك، تەنها دەیویست پەی بە ڕاستییەکان بەرێت، بۆشی دەرکەوت ئەم فیقهە ئاینەیان تێگەیشتنە لە ئایین. ناتوانێ بیگاتێ مەگەر کەسانێك کە بە تەنها بەدوای گەیشتن بەڕاستییەکانەوە بن و ئەو هۆکارانەی دەیگەیەننە ئەو مەبەستە، ئیتر یا بیگاتێ یان نا، بەڵکو ئەو بەردەوام دەگاتە ئەو ڕاستی یە براوەشە با هەقەکە لەسەر دەستی بەرامبەرەکەشیدا ببینێ لە مێزگرد و گفتوگۆیەکاندا.

هەر لە نیشانەی دڵسۆزییەکانی پێشەوا ئەوەبووە کە هەرگیز ڕای خۆی نەسەپاندووە و بەڕاستی تەواو و بێگومان بۆی نەڕوانیوە بەڵکو وەك خۆی دەڵێ: ((ئەم وتەیەی ئێمە ڕای ئێمەیە، ئەو باشترینە کە پێی گەشتووین، هەرکەسیش لەوە باشترمان بۆ بێنێ، ئەوە لە ڕایەکەی خۆمان شایانترە بۆمان))[43].

یان پێیان وت: ئەی ئەبوحەنیفە ئەو فەتوانەی تۆ دەری دەکەیت، ڕاستترین و بێگومانە، ئەویش لە وەڵامدا وتی: سوێند بەخوا نازانم لەوانەیە هەڵەترین ڕا بێت کە گومانی تێدا نییە[44]. وە هەر لە دڵسۆزی پێشەوا –لە دەستکەوتنی زانست– پاشگەزبوونەوەی بوو لەڕاکانی خۆی کاتێ بەرامبەرەکانی فەرموودەیەکی وایان بۆ باس کردبێت لەو بارەیەوە کە لە فەرموودەکانی لای ئەو(صحیح)تر بن هیچ قسەیەکیان لەسەر نەبێت، یان فەتوای یەکێ لە هاوەڵانی پێ بگەشتایە:

زوهەیری کوڕی موعاویە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پرسیارم کرد لە ئەبوحەنیفە دەربارەی ئەمانی (کۆیلە)؟ وتی: ئەگەر جەنگاوەر نەبێت ئەمانەت پێدانی دروست نییە و باتڵە، منیش پێم وت: (عاصم الاحول) لە (فُضِل) کوڕی یەزیدی ڕەقاشییەوە بۆی گێڕامەوە و وتی:

---

[43] تاریخ بغداد ب١٣ لا٣٥٢.

[44] المناقب،المکی ب٢،لا٣٦.

ئێمە گەمارۆی دوژمنانمان ئەدا، تیرێکی ئەمانەت پێدان تەقێنرا و وتیان: ئەمانمان پێ ئەدەن،وتمان ئاخر ئەوە کۆیلەیە، وتیان وەڵامی ئێمە بەندە و سەربەست لەیەك جیاناکەینەوە.

ئێمەش نامەمان نووسی بۆ عمری کوڕی خطاب و ئەویش نووسی بۆمان کە ئەمان بە عەبدیش بدەن، ئەبوحەنیفەش بێ دەنگ بوو، پاشان ماوەی(١٠) ساڵ لە کوفە دوورکەوتمەوە، دواتر هاتمەوە خزمەت ئەبوحەنیفە و هەمان پرسیارم لێ کردەوە دەربارەی ئەمان دان بە کۆیلە، لە وەڵامدا فەرموودەکەی عاصمی بۆ باس کردم و لە فەتواکەی خۆی پاشگەز بووبوویەوە، بۆم دەرکەوت کە شوێن کەوتەی سوننەتە.

*جارێکیان پێیان وت: ئایا پێچەوانەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەکەیت؟ ئەویش وتی: نەفرەتی خوا لەو کەسەی پێچەوانەی پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) دەکات، چونکە بەو خوا ڕێزی لێ گرتووین و ڕزگاری کردووین[٤٥].

*پێی خۆش نەبووە ڕاو فەتواکانی بنووسنەوە، چونکە لەوانەیە لێیان پاشگەزبێتەوە.

لەم بارەیەوە(زوفەر)دەڵێ: ئەچووین بۆ لای ئەبوحەنیفە لەگەڵ (ابو یوسف) و (محمدی کوڕی حەسەنی شەیبانی) و قسە و

---

[٤٥] الانتقاء،ابن عبدالبر لا١٤٥، ١٤٠.

بیروراکانیمان ئەنووسیەوە، جارێکیان بە(ابو یوسف)ی وت: ((بیّ قەزابی یەعقوب هەموو ئەو شتانەی لەمنی دەبیستی مەینووسەوە، چونکە لەوانەیە من ئەمڕۆ رایەکم هەبێت سبەینیّ لێی پاشگەزببمەوە یان سبەینیّ ڕایەکم هەبیّ و دوو سبەی لێی پاشگەزببمەوە))[٤٦].

ئایا ئەمە بووە ئیخلاص و دڵسۆزی پێشەوا ئەبوحەنیفە (ڕەحمەتی خوای لیّ بێت) بۆ فیقهەکەی و ئاینەکەی، هەرگیز دەمارگیر نەبووە بۆ ڕای خۆی، بەڵکو دڵسۆزی و ئیخلاص وای لیّ کردبوو کە لەگەڵ ڕاستی دابێت- لەگەڵ ئەوپەڕی عاقڵی و ژیریەکەیدا-و دڵی کردبوویەوە بۆ وەرگرتنی ڕایەکانی کەسانی تر ئەگەر دەرکەوت ڕاستترن لە ڕایەکانی خۆی.

چونکە دەمارگیری و خۆ بەڕاست زانین لەو کەسانەوەیە کە هەستیان دەیان جوڵێنن نەك فیکر و هۆشیان، یان ئەوانەی مێشکیان لاوازە و سنوری فیکریان تەسکە، پێشەوایش هیچیّ لەوانە نەبووە.

بەڵکو ئەو پیاوە عەقڵ و ژیریەکی بەهێزی هەبووە و دەستی گرتووە بەسەر دەروون و مێشکی خۆیدا، بەدڵسۆزانەوە و بەڕاستی مەبەستی بووە بگاتە هەق و لەخوا ترساوە و هەمیشە دایناوە کەخۆیشی هەڵەبێت.

---

[٤٦] تأريخ بغداد لا٢ ٤٠٢.

و. کەسایەتی بەهێز بووە: لەسەرووی هەموو ئەم ڕەوشتانەوە یەك ڕەوشتی تری هەبووە کە تاجی سەری هەموو سیفاتەکانی تری پێشەوا بووە، ئەوەش بەخششی خودایە بۆ هەندێ لە کەسەکان، ئەو سیفەتەش کەسایەتییە بەهێزەکەی بووە، هەیبەت و قورساییەکەی بووە، کاریگەری لەسەر خەڵکانی دەوروبەری، کێشکردنیان بۆ لای خۆی.

قوتابی گەلێکی زۆری هەبووە، هەرگیز ڕای خۆی بەسەریانا فەرزنەکردووە، بەڵکو پێکەوە دیراسەی لەگەڵ دەکردن و ڕای گەورەکانیانی هەڵدەبژارد و گفتوگۆیان لەسەر دەکرد، بەشێوەی هاوشێوەی خۆی، نەك وەك گەورە لەگەڵ بچووك، لە کۆتاییدا دەگەشتە ڕایەك و هەمووان بێ دەنگ دەبوون و دڵنیا دەبوون.

هەندێ کات هەندێکیان لەسەر ڕای خۆی سوور دەبوو، لە هەردوو حاڵەتەکەدا پێشەوا خاوەنی کەسایەتی و پایەی خۆی بووە.

(مسعر)ی کوڕی(کدام)دەربارەی هەڵقەی وانەکانی ئەبوحەنیفە لەگەڵ هاوڕێ و قوتابیەکانیدا کۆدەبوویەوە و دەڵێ: لەدوای نوێژی بەیانی بڵاوەیان لێ دەکرد بۆ کار و پێداویستی خۆیان، پاشان لێی کۆدەبوونەوە، یەکێ پرسیاری هەبوو، یەکێ گفتوگۆی دەکرد و دەنگیان زۆر بەرزدەکردەوە لەبەر پێویستی پرسیار و

مەسەلەكانیان، پیاوێك كە ئەیتوانی هەموویان هێورکاتەوە و بێدەنگیان بكات ئەو ئەبوحەنیفە بوو، دیاری خودا بۆ ئیسلام[٤٧].

ئەمە كۆمەڵێ لە سیفات و تایبەت مەندیەكانی ئەبوحەنیفە بوو كە هەندێكیان خواكرد بوون، هەندێكیشیان دەستكەوت بوون و خۆی لەسەریان ڕاهێنابوو كە ئەوەش ئەو كەسایەتییە گەورەی بۆ دروست كردبوو.

ئەمەش وای لێ كردبوو سوود لەهەموو خواردنێكی ڕۆحی وەربگرێت، وەك چۆن جەستە پێویستی بە هەموو جۆرە خواردنێكە، ئەمەش ئەو گونجانەی دروست كردبوو لەنێوان ئەو و هاوچەرخەكانی و لەگەڵ مامۆستاكانی و ئەزموونەكانی ژیانی.

لەم هەموو شتانە سوودی وەردەگرت و ئەمەش وای لێكردووە شتێكی نوێ بهێنێتە كایەوە لەبواری ڕا و بیركردنەوەدا، تێڕامانی قووڵ و كاریگەری دوور لەسەر كەسەكان و نەوەكان (الأجيال).

ئەم ڕەوشتانەش وایان كرد لە پێشەوا ئەبوحەنیفە كە دەست بگرێت بەسەر دڵی هاوسۆزانیدا و وایان لێ بكات كە وەسفی چاكەی بكەن، واشی كردووە لە كینەبازان و حەسودەكان كە تانەو تەشەر بدەن لە ژیانی ئەو پیاوە مەزنە.

---

[٤٧] المناقب للمكي ب٢ ج٢٦.

# ماموٚستاكانی پێشەوا

((من لە كانگای زانست و زانیاریدا لەدایك بووم–مەبەستی كوفە– بووە لەگەڵ زاناكانیدا دانیشتم و بەردەوام لە حزوری یەكێ لە گەورە فەقیهەكانیدا ژیاوم)).

ئەمە ئەو ڕستیەیە كە پێشەوا ئەبوحەنیفە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەربارەی گەستی زانیاری و ژیانی خۆی دەریبڕیوە كە هەردەم خوێندكارێك بووە پێش ئەوەی ببێتە موفتی، ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێت كە ئەبوحەنیفە لە ناوەندێكی زانستیدا گەورە بووە. لەگەڵ زاناكانی كوفە دانیشتووە و سوودی زۆری لێ وەرگرتوون و بەرنامەی لێكۆڵینەوەكانیان فێربووە.

پاشان لەناویاندا كەسێكی زانا و زیرەكی هەڵبژارد كە بتوانێ تینوێتی زانستی پێشەوا بشكێنێ و جگە لە ئەو پێویستی بە كەس نەبێت، بەردەوام بۆ ماوەی(٤٠) ساڵ لەبەر دەستی (حمادی كوڕی ابی سلیمان)دا بووە، كە ڕاویەكان لەسەر ئەوەن كە عیلمی فیقهی عێراق گەڕاوەتەوە بۆ لای ئەو لەسەردەمەكەی خۆیدا.

بەڵام زانایانی تریشی بینیوە و زانستی لێ وەرگرتوون و فەرموودەی لێوە گێڕاونەتەوە، بە تایبەت دوای مردنی حماد. كاتێ بە ناچاری كوفەی بەجێهێشت و بەرەو (كەعبەی پیرۆز) بەڕێ كەوت لەبەر ئەوەی لە شەڕ و خراپەی(ابن هبیرە)ی ئومەوی بەدور بێت.

بۆیە هەموو مێژوو نووسەکان، ئەوانەی لەسەر ژیانی پێشەوا قسەیان کردووە باسیان لە بوونی چەند مامۆستایەکی تر کردووە جگە لە(حماد) بەتایبەت لە حەرەمی مەککەی پیرۆزدا.

پێش ئەوەی باسی ژیان مامۆستاکانی بکەین با ئاماژە بۆ سێ شت بکەین:

یەکەم: مامۆستاکانی ئەبوحەنیفە لە دەستە و تاقمە جیاجیاکان بوون، هەر هەموویان لە ئەهلی جەماعە نەبوون، یان هەر هەموویان ئەهلی ڕەئی نەبوون، هەندێ لەوانەی ئەو سوودی لێ وەرگرتوون ئەهلی فەرموودەناسی بوون، یان هەندێکیان فیقهو زانستەکەیان لە وەرگێڕەکەی قورئان عبداللەی کوری عەباس (خوا لێی ڕازی بێت)وەرگرتبوو، وەك بینیمان کە پێشەوا ماوەی(٦) ساڵ لە مەککە نیشتەجێ بوو، شتێکی ڕوونیشە کە مانەوەی لە مەککە ئەو ماوە زۆرە، کە ئەویش خۆی خاوەنی بیر و هۆشی بەهێز و عەقڵ و ژیری کراوە بوو، ئاساییە چاوی بە زانا تابیعینەکان کەوتووە و ئەوانەی کە عیلم و زانستی (ابن عباس)یان لەلا بوو لە ڕاڤەکردنی قورئانی پیرۆز یان لە قوتابی ئەوانەوە.

پاشان زۆرێ لەوانەی لە عیراقدا سودیان بە پێشەوا گەیاندووە لە دەستە و تاقمە جیاجیاکانی شیعەبوون، لەوانە: کیسانییەکان،

یەزیدیەکان، ئیمامییەکان، دوانزە ئیمامییەکان، اسماعیلیەکان. هەموو ئەوانە کاریگەریان هەبووە لەسەر بیروهۆشی پێشەوا، هەرچەندە ڕیوایەت نەکراوە کە بووبێت بە یەکێ لەوان، تەنها لە یەك شتدا نەبێت، ئەویش خۆشەویستی کەسوکاری پێغەمبەرمان(صلی الله علیه وسلم)، وێنەی ئەبوحەنیفە لە عێراق و ڕاوبۆچوونە جیاجیاکانی ئەو کاتە وەك ئەوە وایە یەکێك لە کۆمەڵە خواردنێك بخوات و دواتر ئاسەواری هەموو ئەو خواردنانەی تیا دەربکەوێت، شتێکی وای لێ دروست بێت کە ژیانی لەسەر بەند بێت، پێشەوا ئەبوحەنیفەش هەر بەو چەشنەبوو، لە هەموو ئەو کەس و لایەنانەی وەرگرت و دواتر بیروبۆچوونێکی نوێی لێ هێناکایەوە و لەگەڵ کۆمەڵە ڕایەکی دروست، کە لەو کەس و لایەنانەی وەرگرت بەڵام لەوان باشتر دەرچوو.

دووەم: پێشەوا ئەبوحەنیفە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لەو هەمووە قوتابخانە جیاجیایانە و کەسایەتی جۆراوجۆرانە عیلم و زانست و فەتواکانی هاوەڵانی دەستکەوت، ئەوانەیان کە بە زانای (موجتەهید)و خاوەن ڕا و زیرەکی بێ وێنەبوون.

لە تاریخ بغداد دا هاتووە: ((ئەبوحەنیفە جارێکیان چوو بۆ لای مەنصور،کە لەو کاتەدا (عیسی ی کوڕی موسی)ی لەلا بوو، بە

مەنصوری وت: ئەمە زانای هەموو دونیایە لە ئەمڕۆدا. مەنصوریش پێی وت: ئەم هەموو زانستەت لەکوێ وەرگرتووە ئەی نوعمان؟

پێشەوایش وتی: لە هاوڕێکانی عومەرەوە عیلم و زانستی عومەرم وەرگرت، لە هاوڕێکانی عەلییەوە زانستی عەلیم وەرگرت، لە هاوڕێکانی عبدالله ی کوڕی مەسعودەوە زانستی عبدالله ی کوڕی مەسعودم وەرگرتووە، لەکاتێکدا زانستی (ابن عباس)م وەرگرت لە لە قوتابییەکانیەوە کە لە سەردەمی خۆیدا لە هەموو سەر زەوی لەو زیرەکتر نەمابوو، مەنصوریش وتی: چاك خۆت پڕ چەك کردووە)).

ئەبوحەنیفە هەموو فەتواکانی ئەو هاوەڵانەی پێ گەیشتبوو، وتەکانیشی ئەوە دەگەیەنێت کە هەنگاو بە هەنگاو کاری بە فەتواکانیان کردووە، یان بە لایەنی کەمەوە لە شوێن کەوتوانی ئەوەندەی وەرگرتووە و دەرسی لەلا خوێندوون کە ڕاستەوخۆ ئەوانیش قوتابی هاوەڵە زاناکان بوون.

ئەو هاوەڵانەی کە پێشەوا فەتواکانی وەرگرتوون لە ئەهلی کێشمە کێشمی عەقڵی بوون، ئاستێکی باشیان هەبوو لەبیرکردنەوەی عەقڵی سەربەخۆ لەژێر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا. بۆ ئاسەواری ئەو فەتوایانە بە پێشەواوە بەڕوونی دیاربووە هەر ئەو ئاڕاستەکردنە عەقڵییەش بوو بە هۆی ئەوەی کە بگەڕێ بەدوای هۆکاری حوکمەکاندا و بەکارهێنانی قیاس بۆ هاوشێوەکانیان.

سێیەم:

لە کتێبە ژیاننامەکاندا و هەموویان باس لەوە دەکەن کە پێشەوا هەندێ لە هاوەڵانی بینیوە و فەرموودەشی لێوە گێڕاونەتەوە، بەمەش پلە و پایەی بەرزبۆتەوە بۆ ئاستی (تابعین)، بەمەش ئەتوانرێت بوترێت کە پێشەوا لەچاکیدا کە چووبووە ئاستی تابعین لە زاناکانی هاوچەرخی گەورەتر و لەپێشترە وەك: (الثوري)و(الاوزاعی)و(مالك)و کەسانی تریش.

ڕاویەکان لەوەدا جیاوازیان نییە کە چاوی کەوتووە بە هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، ئەوانەیان کە تەمەنیان درێژبووە و تا سەری سەد ساڵی یەکەمی کۆچی ژیاون و یان کەمتر و لەوانە: ئەنەسی کوڕی مالیك ساڵی(٩٣) کۆچی دوایی کردووە، عبداللەی کوڕی(ابن ابی اوفی)کە لە ساڵی(٨٧) کۆچی دوایی کردووە، (واثیلەی کوڕی ئەسقەع)کە لە(٨٥) ی کۆچیدا وەفاتی کردووە، سەهلی کوڕی ساعید ساڵی(٨٨) کۆچی دوایی کردووە، بەتەمەنترین هاوەڵیش (ابوطفیل عامری کوڕی وائله)کە لە ساڵی(١٠٢) ی کۆچیدا گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگار.

بەڵام لە فەرمودە گێڕانەوەدا لێیان، جیاوازیان هەیە، هەندێ لە زانایان دەڵێن فەرموودەی لێوە گێڕاونەتەوە و هەندێ فەرموودەشیان بەنموونە هێناوەتەوە، بەڵام زانایانی فەرموودە

سەنەدەکانیان لاواز کردووە و هەرچەندە هەندێکیان لەڕێگای ترەوە بەهێزبوون.

بۆ نموونە فەرموودەی:((مَن بني للهِ مسجداً، ولو كمخمص قطاة،بني الله لة بيتاً في الجنّة))و((دع مابريبك الي مالا يريبك))و ((إِنّ الله يحب اغاثة الهفان))و ((طلب العلم فريضة علي كل مسلم))و ((الدال علي الخير كفاعلة))و ((لا تظهر الشماتة لاخيك فيعافية الله و يبتليك))[48].

هەرچەندە زۆرێ لە زانایان لەسەر ئەوە کۆکن کە پێشەوا ئەبوحەنیفە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)با هاوەڵە شیرینەکانی پێغەمبەرمانی (صلى الله عليه وسلم)بینیبێ، بەڵام هەرگیز ڕیوایەتی فەرموودەی لێوە نەکردوون. بەڵگەشیان ئەوەیە کە پێشەوا منداڵ بووە لەوکاتەدا و تەمەنی وانەبووە بگاتە ئەوەی فەرموودە وەربگرێت، لەلایەکی تریشەوە ئەبوحەنیفە خەریکی کەسابەت و دوکانداری بووە و تا شەعەبی هانی نەدا بۆ زانست وەرگرتن خەریکی کاری خۆی بووە.

هەموو سەنەدەکانیش کە ئەبوحەنیفە بیگێڕنەوە خاڵی نییە لە ڕاویەکی درۆزن یان لاواز، هاوڕێ نزیکەکانی وەك: (ابو يوسف و محمد و عبدالله بن مبارك) و (زفر)، هیچ کام لەو ڕیوایەت و

---

[48] المناقب للمكي و الخيرات الحسان و تبيع الصحيفه .

سەنەدانەیان نەنووسیوەتەوە، چونکە ئەگەر ئەوە ڕاست بوایە ئەوان لەپێش هەموو کەسێکەوە ئاماژەیان بۆ دەکرد و ئەیان نووسیەوە[٤٩].

ئەم ڕایەی دووەمیش لە ڕاستییەوە نزیکترە، بەڵام پرسیارێکی تر دێتە کایەوە ئەویش ئایا پێشەوا ئەبوحەنیفە بە(تابعین)هەژمار دەکرێت یان نەخێر؟ زاناکان جیاوازیان هەیە لە پێناسەی (تابعی)دا، هەندێکیان دەڵێن هەرکەسێ هاوەڵانی بینیبێ، ئیتر با هاوڕێیەتیشی نەکردبێت، بەم ڕایە بێت پێشەوا یەکێکە لە(شوێن کەوتوان) التابعین.

بەڵام هەندێ تر لە زاناکان دەڵێن لەگەڵ بینینەکەشدا، دەبێت هاوڕێیەتیشی کردبێت و زانستیشی لێ وەرگرتبێت، کەواتە لای ئەوانە پێشەوا(تابعی) نییە، مەگەر لەسەر ئەو ڕیوایەتەی کە فەرموودەی لێ وەرگرتوون.

هەرچۆنێ بێت هەموو لەسەر ئەوەن کە چاوی کەوتووە بە هەندێ لە تابعین و لەگەڵیان دانیشتووە و فەرموودەی زۆری لێ وەرگرتوون و تەمەنیشی بۆ ئەوە لەباربووە.

هەموو ئەوانەی پێشەوا زانستی لێ وەرگرتوون هەریەکە و پرۆگرامێکی جیای هەبووە، هەندێکیان بەزانای (الاثر) ناسراون، واتە: شوێنکەوتەی پێش خۆی یەکێ لەوانە(الشعبی)، هەندێکی تر ناوی نراوە زانای (الرأی) واتە لەگەڵ شوێنکەوتنی زانایانی پێش

---

[٤٩] الخیرات الحسان لا٢٥.

خۆیان ڕای خۆیشیان هەبووە لەسەر مەسەلەکان و ئەوانەس زۆربوون و لەوانەی زانستی (ابن عباس)ی لە عەکریمەوە وەرگرتووە و زانستی(ابن عمر)یشی لە نافیعەوە وەرگرتووە، (عطاء)ی کوڕی (ابی رباح)زانای فیقهزانی مەککە، وادیارە ماوەیەکی زۆر پەیوەندی پێوەی هەبووە، ئەگێڕنەوە گفتوگۆی سەبارەت تەفسیر کردووە لەگەڵی و لەبارەیەوە لە(الانتقاء)دا هاتووە دەڵێ:

ئەبوحەنیفە گێڕایەوە وتی:بە عطای کوڕی ئەبی ریباحم وت، تۆ چی دەڵێی دەربارەی ئەو وتەیەی پەروەردگار کە دەفەرموێ: ﴿وَءَاتَيْنَـٰهُ أَهْلَهُۥ وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ﴾ عطاء وتی: خێزانەکەی پێدا و وێنەی خێزانەکەشی پێدان. منیش پێم وت: ئایا دەبێت شتێك بدرێتە پاڵ پیاو کە هی خۆی نەبێت؟

عطایش وتی: ئەی تۆ چی دەڵێی لەو بارەیەوە؟

دەڵێ پێم وت: ئەی باوکی محمد خێر و پاداشتی خێزانی، خێروپاداشتی شێوەی پاداشتەکەی ئەوان.

ئەویش وتی: تەواوە ئەمەی تۆ ڕاسترە و خوایش باشتری لێ دەزانێت.

ئەگەر ئەم ڕیوایەتە جێگیر بێت ئەوە دوو مانای هەیە:

**یەکەم:** دیارە ئەبوحەنیفە لەگەڵ (عطاء)ی کوڕی (ابی رباح)دا دانیشتووە و دیراسەیان پێکەوە کردووە. بەوەی کە عەتا لە(١١٤)

دا کۆچی دوایی کردووە. واتە چەندان جار پێشەوا چووە بۆ حەج و لەوێ چاوی بە گەورە زانایان کەوتووە و گفتوگۆی زانستی لەگەڵ کردوون و لەکاتێکدا ئەو خوێندکاری بەردەستی (حماد)بووە و ئەم خوێندکاریەشی ڕێگر نەبووە لەوەی کە چاوی بە زانایانی تر بکەوێت.

دووەم: مانای ئەوەس دەگەیەنێت کە (عطاء) وانەی تەفسیری هەبووە لە مەککەدا، چونکە عیلمەکەی لە(ابن عباس)ەوە وەرگرتووە، کە بە(ترجمان القران)و زانستی ناسیخ و مەنسوخ ناسراو بووە(خوا لێی ڕازی بێت).

جا با ئێستا هەریەکە لەو زانایانەی وانەیان بە پێشەوا وتووە، وتەیەکیان بهێنین کە هەریەکەیان ڕەنگێکی بیرکردنەوەی جیابووە، تا بە هەموویانەوە بۆمان دەربکەوێت کە چۆن پێشەوا لە کانیاوە جیاجیاکانەوە زانست و ڕۆشنبیری خۆی دەوڵەمەند کردووە.

ناسراوترین مامۆستای کە بەردەوام لە خزمەتیدا بووە(حمادی کوڕی سولەیمان)ە کە وەلای بۆ ئەشعەریەکان هەبووە، چونکە خۆی مەوالی ئیبراهیمی کوڕی موسای(الاشعری)بووە، ئەویش لە کوفەدا سەری هەڵدا، فیقهیشی لە (ئیبراهیم النخعی)یەوە وەرگرتووە، زاناترین کەس بووە بە ڕاکانی ئەوەوە و لەساڵی(١٢٠)ـی کۆچیدا کۆچی کردووە. بە تەنها فیقهی-نەخەعی-وەرنەگرتووە، بەڵکو

لەگەڵ ئەوەشدا زانستی فیقهی (الشَعَبي) وەرگرتووە کە ئەو دوانەش لە شورەیح و عەلقەمەی کوڕی قەیس و ماسروق کوڕی ئەجدەع، ئەوانیش لە هەردوو هاوەڵی پێغەمبەرەوە(صلی الله علیه وسلم) فیقهەکەیان وەرگرتووە، کە ئەوانیش عبداللەی کوڕی مەسعود و علی کوڕی ئەبی طالیب بوو(خوا لێیان ڕازی بێت).

چونکە ئەو دوو هاوەڵە ماوەی ژیانیان لە کوفە دا تەواوکردووە و فیقهێکی زۆری خۆیان تێدا بڵاوکردۆتەوە، کە بە کۆمەڵەکەی فیقهی کوفییەکان دادەنرێت.

بە فەتوای ئەو دوانە و پاشان قوتابییەکانیان، پرۆگرامێکی مەزنی وایان گرتەبەر کە پاشماوەیەکی فیقهی مەزنی لێ دروست بوو، حمادیش ئەم فیقهەی پێ گەیشت کە فیقهی ئیبراهیم النخعی و فیقهی الشعبی، بەڵام بە فیقهی ابراهیم زیاتر ناسرا کە بە فیقهی ئەهلی رەئی ناسراو بوو. چونکە شەعەبی زیاتر بە زانایانی (الاثر)ناسراو بوو تا-الرأی-ئیتر با لە عێراقیشدا ژیا بێت و لەوێ خوێندبێتی، چونکە حەزی بە ڕێبازی ئەهلی ڕەئی نەکردووە و ڕقیشی لێ بووە.

پێشەوا ئەبوحەنیفە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ماوەی هەژدە ساڵ لە خزمەت مامۆستاکەیدا بووە(حەماد)و، هەموو فیقهی ئەهلی عێراقی پێبوو کە ئەویش پوختەی فیقهی عبداللەی کوڕی مەسعود

بوو، بەتایبەت ئەو فەتوایانەی لێ وەرگرت کە لە (ابراهیم النخعی)یەوە وەرگرتبوو. تەنانەت (الدهلوی) دەڵێت: ((سەرچاوەی فیقهی حەنەفییەکان وتەکانی ناخەعییە، گوێ بگرە لە(حجة الله البالغة)دا چی دەڵێت: ئەبوحەنیفە(ڕەحمەتی خوای لێ بێت)وای لە قوتابییەکانی کردبوو تەنها لەسەر ڕێڕەوی (ابراهیم النخعی) بڕۆن و لێی لا نەئەدا مەگەر زۆر بە کەمی، زۆر زانا بوو لە دەرهێنانی ئەحکام لەسەر مەزهەبەکەی، زۆر وورد بوو لە هونەری دەرهێناندا و لقەکانی لەسەر دادەڕشت بە تەواوترین شێوە، ئەگەر ئەتەوێ ڕاستی ئەم قسەیەی ئێمە بزانیت:

وتەکانی ابراهیم النخعی و هاوچەشنەکانی لە کتێبی (الاثار) و (جامع عبدالرزاق)و(مصحف ابی بکر بن شیبه)و پاشان بەراوردی بکە بە مەزهەبی ئەبوحەنیفە، دەبینی بە هیچ شێوەیەك لێیان لانادات مەگەر لە چەند شوێنێکی کەمدا نەبێ کە هەر لە ڕێڕەوی زانا کوفییەکان لای نەداوە))[50].

ئەمەش وادیارە بەهۆی زۆرمانەوەی ئەبوحەنیفە لەخزمەت مامۆستاکەیدا (حماد بن سلیمان)و ئەویش زاناترین کەس بووە بە فیقهی ابراهیم النخعی–وەك هەموو ڕاویەکان بۆی دەچن.

---

[50] حجةالله البالغة ب ١ لا١٤٦.

*وەك وتمان لەو كاتەشی كە پێشەوا بەردەوام لە حزوری مامۆستاكەیدا بووە هەر لە زانایانی تریشەوە شتی وەرگرتووە، پاشان دوای مردنیشی لەوانە و دەستكەوتنی زانست دانەبڕاوە و خەڵكی فێردەكرد و خۆیشی فێر دەكرد، ئەمەش ڕەوشتی زانا ڕاستگۆكانە كە بەم وتەیە كار دەكەن كە دەڵێت:

((لایَزال عالماً ما یطلب العِلم، فاذا ظنّ إِنه علم فقد جهل)) واتە: مرۆڤ زانایە كە مادەم هەوڵی فێربوونی بەردەوام دەدات و هەركاتێ زانی بوو بە زانا و بەسیەتی، ئەوە نەفام و جاهیلە.

هەروەك لە وەرزەكانی حەجدا بەردەوام لە خزمەت (عطاء)ی كوڕی(ابن ابی رباح) دەبوو، تەنانەت دەڵێن نزیكەی(٥٥) حەجی كردووە، كە هەر لە گەنجییەوە دەستی كردووە بە حەجكردن و هەموو ساڵێك بەردەوام بووە لەسەری. هەرچەندە ئەم ژمارەیە نە بەڕاست ئەزانین و نە بە درۆ، بەڵام وادیاربووە كە وەرزی حەجی بەهەل زانیوە بۆ دەوڵەمەندكردنی زانستی فیقهی و تەفسیری خۆی و سوودی باشی لێ وەردەگرت، هەروەك بۆ بەهێزبوونی لایەنی ڕۆحی و تەقوای زۆر پێویست بووە.

*كەواتە ئەتوانین بڵێین فیقهی ئیسلامی بە هەموو بیرو بۆچوونەكانەوە وەرگرتووە، هەرچەندە وەك ئەهلی ڕەئی و سەركردەی ئەهلی ڕەئی ناسراوە، بەڵام پێشەوا ئەبوحەنیفە هەر بەو

زانا مەزنانەوە نەوەستا بەڵكو زانستیشی لە پێشەواكانی شیعەشەوە وەردەگرت و لەگەڵیاندا گفتوگۆ و دیراسەی دەكرد، هەڵوێستی زۆریشی هەیە لە پاڵپشتیكردنیان هەر لە لاوێتییەوە تا سەردەمی پیریش، تەنانەت لەسەر خۆشەویستی و لایەنگری و دڵسۆزی بۆ خانەوادەی پێغەمبەرمان(صلى الله عليه وسلم)گیانی بە شەهیدی بەخت كرد و لەسەر هەق و ڕاستی و دونیا نەویستی گیانی خۆی دانا.

لەوانە چاوی بە پێشەوایان: زەیدی كوڕی عەلی و محمد الباقر و جعفر الصادق و (ابی عبدالله محمد بن الحسن)كە هەریەكەیان لە عیلم و زانستدا پلە و مەقامێكی مەزنیان هەبووە.

پێشەوا زەیدی كوڕی عەلی (زین العابدین رحمه الله) كە لە ساڵی(١٢٢) ی كۆچیدا كۆچی كردووە، زانایەكی زۆر هۆشمەند بووە لە هەموو زانستە ئیسلامییەكانی وەك زانستی (قراوات) و (زانستەكانی قورئان) و (فیقهزان) و (زانا لەبواری بیرو باوەڕدا بەجۆرێ لە-موعتەزیلەكان- بە مامۆستای خۆیانیان دەزانی لەو بوارەدا).

دەڵێن ماوەی دوو ساڵ لەلای ئەو وانەی خوێندووە،تەنانەت لە(الروض النضیر)دا هاتووە كە ئەبوحەنیفە وتوویەتی: ((زەیدی كوڕی عەلی و خانەوادەكەشیم بینی، لە سەردەمەكەی خۆیدا لەو زیرەكترم نەدیبوو، لەویش فیقهزانترم نەدیوە، خێرا وەڵام دەرەوەم

نەدیوە، یان قسەکەر بە ڕوونترین شێوە، بێ وێنە بوو لەناو هاوەڵانیدا)).

ئێمە گومانمان نییە لەوەی کە گەیشتووە پێی، بەڵام باوەڕ ناکەین کە هاوڕێیەتی کردبێت بەڵکو لێکۆڵینەوە و گفتوگۆی زانستی و فیقهی لەگەڵدا کردووە.

*(محمد الباقر)ی کوڕی(زین العابدین)کە برای زید–ڕەحمەتی خوایان لێبێت–بەڵام پێش ئەو مردووە، کە یەکێکە لە پێشەواکان کە شیعە دەیدەنە پاڵ خۆیان، هەموو لەسەر ئەوەن کە یەکێکە لە ئیمامەکانیان بە تایبەت دوانزە ئیمامی و ئیسماعیلیەکان، کە ئەو دوانەش ناودارترینیانن.

پێیان وتووە (باقر)چونکە زانستی کردوتە (بقر)یانی ئەوەندە زانایەکی مەزن بووە، هەرچەندە لە نەوەکانی پێغەمبەرە(صلی الله علیە وسلم)، بەڵام هەموو هاوەڵانی خۆشویستووە و جیاوازی نەخستۆتە نێوانیان، تەنانەت جارێکیان هەندێ لە عێراقییەکانی لەلابوو، بە خراپە باسی (ابو بکر و عمر و عثمان)یان کرد لەلایدا، ئەویش زۆری پێ ناخۆش بوو، توڕە بوو وەك سەرزەنشتێك پێی وتن ئایا: ((ئێوە لە کۆچەریاکانن ئەوانەی بە ناڕەوا لە ماڵ و حاڵیان دەرکران؟ وتیان نەخێر، وتی: ئەی ئێوەن ئەوانەی کە بەماڵ و حاڵ و ئیمانەوە پێشوازیان کرد لە کۆچەریەکان؟وتیان نەخێر.

ئەویش وتی: دەی بێگومان لەوانەش نین کە دوای ئەوان هاتن و دووعای خێریان ئەکرد بۆ ئەوانەی پێش خۆیان کە کۆچەریان و پشتیوانان بوون، کە خوا ئەفەرموێت: ﴿ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَـٰنِ﴾ الحشر: ١٠.

دەی هەستن لاچن لەلاما، خوا ماڵتان ئاوا نەکاتدان بە ئیسلامدا دەنێن و هێشتا نەبوونەتە نموونەی موسوڵمان ))[٥١]، لەساڵی (١١٤) دا کۆچی کردووە لە دونیای فانی.

* * *

[٥١] البزازی،دەڵێن (١١٧)ی کۆچی وەفاتی کردووە بەڵام (١١٤) ڕاسترە.

## جوانترین گفتوگۆی پێشەوا لەگەڵ (محمد باقر):

(محمد باقر)ڕەحمەتی خوای لیّ بێت زانستێکی زۆری هەبوو، وادیارە یەکەمین گەیشتنی پێشەوا (محمد باقر) ئەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای دەرکەوتنی، وەك هەڵگرێکی قوتابخانەی (الرأی)، واتە بەکارهێنانی عەقڵ و ڕەئی لە زانستە ئیسلامییەکاندا لە تەنیشت دەقەکانی قورئان و سوننەت و کار و وتەی هاوەڵان دا. کە بۆ یەکەم جار لە شاری مەدینە سەردانی (محمد باقر) دەکات و خۆی پیّ دەناسێنێت و ئەویش دەڵێت: تۆ ئەو کەسەیت ئاینەکەی باوام و فەرموودەکانیت بە(قیاس)کردن گۆڕیووە؟

پێشەوایش وتی: پەنا بەخوا. ئەویش وتی: با، با، گۆڕیوتە. ئەبوحەنیفەیش (ڕەحمەتی خوای لیّ بێت) پێی وت: تۆ فەرموو بڕۆ جێگاکەی خۆت دانیشە کە شایستەی جەنابتە، با منیش بەو شێوەیە دابنیشم کە شایانمە، چونکە ڕێز و حورمەتێکت هەیە وەك چۆن باپیرت لەناو هاوەڵانیدا هەیبووە، ئەویش دانیشت. پێشەوایش لەسەر ئەژنۆکانی بەڕێزەوە لە حزووریدا دانیشت و پاشان وتی: من سیّ پرسیار لە بەڕێزتان دەکەم وەڵامم بدەرەوە:

یەکەم: ئایا پیاو لاوازە یان ئافرەت؟ وتی: گومانی تێدا نییە ئافرەت. پاشان لێی پرسی ئافرەت چەن بەشی هەیە؟ وتی یەك بەش، وتی: ئەی پیاو؟ وتی: دوو بەش، ئەبوحەنیفەیش وتی: ئەمە

له ئاینی باپیرتدا، ئه‌گه‌ر من بمویستایه ئاینی باوات بگۆڕم–به قیاس–وا باشتر بوو ئافره‌ت دوو به‌ش به‌رێت و پیاو یه‌ك به‌ش، چونکه ئافره‌ت لاوازتره له پیاو.

دووه‌م: پاشان لێی پرسی نوێژ گه‌وره‌یه یان ڕۆژوو؟ ئه‌ویش وتی: نوێژ، پێشه‌وا وتی: ئه‌مه وته‌ی باپیرته، به‌ڵام گه‌ر بمویستایه به قیاس بیگۆڕم به‌پێی قیاس ده‌بوایه فه‌رمانم به ئافره‌تان بدایه که له دوای پاکبوونه‌وه نوێژ بیگێڕنه‌وه نه‌ك ڕۆژوو.

سێیه‌م: پاسان لێی پرسی: ئایا میز پیسه یان مه‌نی–ئاوی پیاوان– وتی: بێگومان میز پیستره. وتی: ده‌ی گه‌ر بمویستایه ئاینی باپیره‌ت بگۆڕم به‌پێی قیاس فه‌رمانم ئه‌کرد شوێنی میز بشۆرێت و بۆ مه‌نی ته‌نها ده‌ستنوێژگرتن به‌س بوو، به‌ڵام په‌نا ئه‌گرم به‌خوا که‌من ئاینی باوات بگۆڕم به قیاس پێشه‌وا (محمد باقر)ڕه‌حمه‌تی خوای لێ بێت هه‌ستایه سه‌رپێ و باوه‌شی پێداکرد و چاوانی ماچ کرد.

(موفق المکی) له (المناقب)ه‌که‌یدا ئه‌م گفتوگۆیه‌ی هێناوه، به‌م ڕووداوه‌شدا وادیاره یه‌که‌م جار بووه چاوی به (امام محمد الباقر) بکه‌وێت، چونکه وا پرسیاری لێ ده‌کرد بڵێیت نایناسێت، کاتێك بۆی ده‌رکه‌وت که له‌گه‌ڵ بوونی ده‌قدا قیاسی به‌کارنه‌هێناوه هه‌ستا و ماچی کرد.

هەروەها ئەوەش دەگەیەنێت کە پێشەوا ئەبوحەنیفە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) بەهەڵگری مەشخەڵی ڕەئی و قیاس کردن ناسراو بوو، کە تا ئەو کاتەش هەر لە خزمەت مامۆستاکەیدا –حماد– خوێندکار بووە، خوێندکاربوونەکەی نەبووەتە ڕێگر لەبەردەم مەشهوربوونی لەناو خەڵکدا. چونکە (حماد) ساڵی(١٢٠) کۆچی کردووە و بەڵام پێشەوا باقر لەساڵی (١١٤) کۆچی کردووە، دیارە ئەم گفتوگۆیە یەکەم چاوپێکەوتنیان بووە لەگەڵ یەکتر.

هۆکاری ئەوەی پێشەوا ئەبوحەنیفە هەر لە قوتابیەتییەوە لەناو موسوڵماناندا مەشهور بووە، زۆر سەفەرکردنی بۆ شاری بەسرە بۆ گفتوگۆ و میزگرد لەگەڵ دەستە و تاقمە جیاجیاکاندا.

هەروەك پێشەوا ئەبوحەنیفە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) پەیوەندی زانستی هەبووە لەگەڵ (محمد باقر)دا، هەروەها لەگەڵ کوڕەکەشی (جعفر الصادق)کە هاوتەمەنی خۆی بووە، هەرچەندە دوو ساڵ پێش پێشەوا ئەبوحەنیفە کۆچی کردووە دەربارەی (الصادق) دەڵێت: ((سوێند بەخوا نەم دیوە لە جەعفەری صادق زیرەك تر و فیقزانتر بووە)).

* (مرفق المکی) لە (المناقب)دا هێناویەتی: کە ئەبو جەعفەری مەنسور پێی وتووە: ((ئەی ئەبوحەنیفە خەڵکی هەموو سەرسام بوون بە جەعفەری کوڕی محمد هەندێ مەسەلەی فیقهی قورسی بۆ

ئامادە بکە و پرسیاری لیّ بکە. ئەبوحەنیفەیش گوێڕایەڵی کرد و (٤٠) مەسەلەی گرنگی بۆ ئامادە کرد، ئەبوحەنیفە خۆی دەگێڕێتەوە کە کاتیّ چووە بۆ حیرە چووەتە لای ئەبو جەعفەری مەنسور دەڵیّ: ((کاتیّ چووە ژوورەوە (جعفری کوڕی محمد الصادق) م بینی هەیبەتیّ دایگرتم، کە هەرچەندە چووبمە لای مەنسور بەو شێوە هەیبەت نەیگرتبووم، بینیم لای ڕاستی خەلیفەوە دانیشتبوو، سڵاوم لیّ کرد، ئاماژەی کرد کە دانیشم پاشان ڕوی کردە جەعفەری صادق وتی: ئەی باوکی عبدالله ئەمە ئەبوحەنیفەیە؟

وتی بەڵیّ خۆیەتی، پاشان لای کردەوە بۆ لای من و وتی: ها ئەبوحەنیفە چیت هەیە لە پرسیار ڕووبەڕووی ئەبو عبداللەی بکەرەوە، منیش یەك یەك پرسیارەکانم لیّ کرد، ئەویش وەڵامی ئەدامەوە، ئەیوت: لەوبارەیەوە ئێوە وا دەڵێن، ئەهلی مەدینەش وا دەڵێن، ئێمەش وا دەڵێین، لە هەندێکیانا لەگەڵماندا بوو، لە هەندێکی تردا پێچەوانەی ئێمە بوو یان لەگەڵ ئەهلی مەدینەدا بوو، تا هەر(٤٠) پرسیارەکەم ئاڕاستەکرد، پاشان ئەبوحەنیفە وتی: زاناترین کەس ئەو زانایەیە کە ئاگای لە بیروڕا جیاجیا کان بێت)).

ئەم ڕیوایەتەش ئەوە دەگەیەنێت کە پێشەوا ئەبوحەنیفە هەر لە یەکەم چاوپێکەوتنی جەعفەری صادقەوە، پلەوپایەی ئەو پیاوەی بۆ دەرکەوت و جەعفەریش ڕای تایبەتی خۆی هەبووە لە فیقهدا،

ئەمەش پێش ئەو ناکۆکی و گرژیەی لەنێوان مەنسور و عەلەویەکاندا ڕووی دابێت. زانایان لەسەر ئەوەن کە(جعفر الصادق) دابنێن بە یەکێ لە مامۆستاکانی ئەبوحەنیفە هەرچەندە هاوتەمەنیشی بووە.

* (ابو محمد عبدالله)ی کوڕی(حسن)ی کوڕی(حسین)و پێشەوا لەبەردەستیدا وەك خوێندکار وانەی فیقهی لەلا خوێندووە، وەك (المکی) و (البزازی) لە (مناقب)ەکەیاندا وتوویانە. کە ئەو مامۆستایەی پێشەوا زانایەکی فەرموودەناس وخاوەن متمانە و ڕاستگۆ بووە، سوفیانی سەوری و مالك و کەسانی تریش لەوەوە فەرموودەیان ڕیوایەت کردووە.

زۆر مەزن بووە لەلای زاناکان، خواپەرستێکی گەورە و بەڕێزبووە. بە وەفد چووە بۆلای خەلیفە عمری کوڕی عبدالعزیز و ڕێزێکی زۆری لێ ناوە، لە سەرەتای دەستبەکاربوونی عەباسیەکانەوە سەفاح زۆر ڕێزی لێ گرتووە و کە گەڕاوەتەوە(١٠٠٠) درهەمی بەدیاری داوەتێ. بەڵام کاتێ مەنسور هاتە سەر حوکم بە شێوەیەکی خراپ هەڵسوکەوتی لەگەڵ کرد، هەروەها لەگەڵ منداڵ و خێزانیدا و زۆربەیانی توندی زیندانەکانی کرد.

ئەم هەڵسوکەوتە توند و ستەمکارانەیەی مەنسور لەگەڵ عەلی زادەکان بە تایبەت بنەماڵەی عبداللەی کوڕی حەسەن، کە دڵی

پێشەوا لە عەباسیەکان و مەنسور بەتایبەتی بگۆڕێت و لە وانە و وتارەکانیدا زۆر بە توندی هێرشی کردووەتە سەریان، ئەمەش هەروەك فارسەکانی تریش چونکە ئەمیش لەلای ئەو عەلی زادانە خوێندوویەتی.

عبدالله لە سالّی(١٤٥) ی کۆچیدا وەفاتی کردووە و تەمەنی(٧٥) سالّ بووە واتە(١٠) سالّ لە پێشەوا گەورەتر بووە.

*بێگومان مامۆستاکانی پێشەوا تەنها لەوانە نەبووە کە ئەهلی زانایانی کۆمەڵی موسولّمانان بوون، بەڵکو سودیشی وەرگرتووە لەو زانایانەشی کە لە(المناقب)دا بە شوێنکەوتووانی هەواوئارەزوو ناوبانگیان دەرکردووە، دەڵێن لەوانە جابری کوڕی یەزیدی جەحەفی، کە یەکێکە لە ڕۆچووەکانی ناو شیعە و باوەڕیان وابووە پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) سەرلەنوێ دێتەوە و عەلی و پێشەواکانی تریش دێنەوە، هەرچەندە (البزازی) لە (مناقب: ابی حنیفە)دا باسی لەوە کردووە، کە جەحەفی سەر بە سەبەئییەکانە کە باوەڕیان وابووە عەلی خوابووە یان لەخوا جیا نییە–پەنا بەخوا–.

بەڵام ئەوە دوورە لە ڕاستییەوە، چونکە ناچێتە عەقڵەوە ئەبوحەنیفە بەو هەموو پلە و پایە زانستییە گەورەوە لە کافر و بێ باوەڕێك زانستی وەرگرتبێت. بەڵێ وادیارە ئەبوحەنیفە گوێی گرتووە بۆ هەندێ مامۆستا کە زانیوویەتی و باوەڕیشی وابووە کە لادەر و

سەرلیَ شیَواون. بۆیە پیَشەوا دەربارەی جەحەفی دەلْیَ: ((جابر الجحفي أفسد نفسه بالهوي الذي أظهره)) واته: جابر الجحفی به هەواو ئارەزووەی بلآوی کردۆتەوە خۆی لەناو بردووە.

زۆر جار ناوی بردووە و نەشی هیشتووە هاورِیَکانی و قوتابیەکانی توخنی بکەون و لەگەلْی دانیشن، ئەترسا ئەوانیش تیَك بدات، چونکە زۆر زیرەك و لیَزانانە بۆی دەچوو کاری تیَ ئەکردن و ئەوانیش شویَنی ئەکەوتن لەلادان و سەرلیَشیَواویەکەیدا.

لە(میزان الاعتدال)دا هاتووە کە بە درۆزن ناوی بردووە، لەو بارەیەوە ئەبو یەحیا الحمدانی دەلْیَ گویَم لە(ابو حنیفه)بوو دەیوت: ((لەو زانایانەی دیومن لە(عطاء)باشترم نەدیوە و لە جابر الجحفی درۆزنتریشم نەدیوە))[52].

کەواتە وادیارە پیَشەوا زانستی وەرگرتووە لە هەموو ئەوانەی کە عاقلْی و توانای فیکریان تیابووە، بەلآم هەندیَ لادان هەبووە لە بیرکردنەوەیاندا و ئەویش ئەوەی رِەدکردۆتەوە و لیَی وەرنەگرتوون، واتە وەك سیَویَك لا جوانەکەی بخۆیت و لا گەنیوەکەشی فرِیَ بدەیت.

---

[52] المناقب المکی ب ١ ل٢٧٤.

ئەم کارەش نابێت هەموو کەس بیکات چونکە هەموو کەس لە قووە و هێزی بیرکردنەوەی پێشەوا نییە، کە بتوانێ لە بیروبۆچوونە خراپەکانی خۆی لابدات و سوود لە لایەنەکانی وەربگرێت.

ئەمەش تەنها و تەنها کەسە زۆر ژیرەکان دەتوانن پێی هەستن، هەوڵیان داوە ئەو زانستانەش فێربن کە لەلای ئەو جۆرە کەسانەیە کە قسەیان لەسەرە و دەتوانن لە لایەنە خراپەکەی خۆیان بەدوور بگرن. چونکە زانایانی ئەو سەردەمەی پێشەوا دوو جۆر بوون:

جۆرێکیان تەنها خەریکی فیقهی ئیسلامی بوون ولایان نەداوە لێی هەرچەندە زۆر زانا و زیرەکیش بوون لە ڕاوبۆچووندا.

جۆرێکیشیان قووڵ ئەبوونەوە لە بیروباوەڕ و زانستە عەقڵییەکاندا هاوکات لەگەڵ خوێندنی زانستی فەرموودە و فیقهدا، کە ئەبوحەنیفەیش یەکێك بووە لەوانە، چونکە کەمن ئەوانەی بتوانن هەردوو لایەنەکە بگرن و لادان و سەرلێشێوان ڕوونەکاتە بیروهۆشیان، بەڵام پێشەوا توانی هەردوو لایەنەکە کۆبکاتەوە و زانست لەهەموو دەزگاکانەوە وەربگرێت. هەر کاتێ زانیبێتی قوتابیەکانی لەو ئاستەدا نەبوون نەیهێشتووە هەردوو لایەنەکە بگرن، پێی وتوون تەنها و تەنها لەگەڵ زانستی فیقهدا بن و لێی لامەدەن و ئەبو نەیدەهێشت (حەماد)ی کوڕی بەزانستی کەلامەوە خەریك بێت کە زۆریش لێهاتوو بوو لەو بوارەدا.

## شێوازی تایبەت لە خوێندن و ئەزموونندا:

ژیان و بەسەرهات و فیکر و هۆش و ئەزموونەکانی پێشەوا، ئەوەیان ئەگەیاند کە ئەم لاوە لە دواڕۆژدا دەبێتە زانا و فەقیهی هەموو عێراق هۆکارەکانی چی بوون؟

یەکەم: لەماڵێکی بازرگاندا گەورەبووە، لە ژیانیدا لە بازرگانی دانەبڕاوە و لەگەڵ شەریکەکەیدا، توانیویەتی لەگەڵ خوێندن و زانستدا بەردەوامی بە بازرگانییەکەی بدات بۆ بژێوی ژیانی بە سەربەرزانە.

ئەم کارەشی کە شارەزای وردەکاریەکانی بازاڕ و بازرگانی بوو بە ڕێپیشاندەری، توانی سەرکەوتووانە لە موعامەلات و ئەحکامی تایبەت بە کڕین و فرۆشتن دا توانایەکی باشی هەبێت و وەك قسەی شارەزایەکی خەبیر لێی وەربگیرێت. هەر هۆی ئەمەش بوو کە لەلای پێشەوا کارکردن بە عورف و عادەت گرنگییەکی تایبەتی هەبووە لە هەڵگۆزینی مەسەلە فیقهییەکانیدا، لەو مەسەلە نوێیانەدا کە دەقی ئایەت و فەرموودەی لەسەر نەهاتبێت کە دواتر بە درێژی باسی لێوە دەکەین.

هەر ئەو شارەزایەشی بووە لە بازرگانیدا وای لێ کرد و بەجوانترین شێوە کاربە (الاستحسان) بکات، کاتێ کە قیاس کردن

پێچەوانەبێتەوە لەگەڵ بەرژەوەندی خەڵکی یان لەگەڵ دادپەروەری یان عورف و عادەت.

محمدی کوڕی حەسەن- کە قوتابی پێشەوا بوو- دەڵێ: ((ئەبوحەنیفە لە مەسەلە قیاسیەکاندا گفتوگۆی لەگەڵ دەکردین، جار جار هاوڕای دەبوون و جار جاریش ڕای جیاوازیان دەبوو لەسەر قسەکانی، بەڵام هەر کە وتی: (من وای بەباش دەزانم) (استحسن)، ئیتر کەس قسەی نەئەما لە قسەیدا، ئەمەش بەهۆی زۆر بەکارهێنانی (إستحسان) لەشوێنی گونجاوی خۆیدا و هەر هەموویان بێدەنگ دەبوون و هاوڕای دەبوون)).

ئەمەش تەنها لەبەر ئەوە بوو کە زۆر بە ووردی پەی بە شتەکان دەبرد، پەیوەندی ڕاستەوخۆشی بە موعامەلە و شمەکەکانی خەڵکەوە بوو، کە کاتێ (إستحسان)ی بەکاردەهێنا لەو زانست و شارەزاییەیەوە بوو، کە لە ڕێگەی بازرگانییەکەیەوە و هەم لە ڕێگەی زانستە بێ ئەندازەکەیەوە بوو لە بواری شەرع و سەرچاوەکانی شەرعەوە بوو.

دووەم: ئەبوحەنیفە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) زۆر سەفەر و گەڕانی کردووە، وەك مێژوو نووسەکان باسی لێوە دەکەن(٥٥) جار حەجی کردووە. ئەمەش ژمارەیەکە کەم نییە-با هەندێ زیادە ڕەویشی تیدا بێت- نیوەی ئەوەش بێت هەر زۆرە، تەنها بۆ حەج

نەچووە بەڵکو گفتوگۆی زانستی و بۆ گێڕانەوەی فەرموودە و فەتوادان و دانیشتن لەگەڵ کەڵە زاناکانی ئەو سەردەمە. کە یەکەم جار لە مەوسیمی حەجدا چاوی کەوت بە زانای گەورە (عطاء ی کوڕی ئەبی ڕیباح)و ئەویش لێی پرسی: لەکوێوە هاتوویت؟

پێشەوا وتی: لە کوفەوە هاتووم.

عەتا وتی: لەو شارەوەی کە دینیان کرد بە شیعەگەرایی؟ پێشەوا وتی: بەڵێ، پاشان عەتا وتی: ئەی لەکام دەستە و تاقمی؟ وتی: لەو تاقمەم کە جنێو و سوکایەتی بە سەلەف و پێشینەکان ناکات و باوەڕی بە قەزا و قەدەر هەیە و بە تاوانیش کەس کافر ناکات. عەتا پێی وت:بۆم دەرکەوت، لەسەر ئەو ڕێبازە بەردەوام بە.

هەر لە حەجدا دەچوو بۆلای پێشەوا مالیك و پێشەوا ئەوزاعی و گفتوگۆی فیقهی و فەرموودەی لەگەڵدا دەکردن. بۆیە هەموو سەردانەکانی بۆ حەج و ماڵی خوا مەبەستی زانستیشی لەپشتەوە بووە، چونکە دەیزانی کانگای وەحی و دابەزینی دواین پەیامی خوا و دیمەنەکانی ژیانی پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم)لێیە، بۆ ئەوەی لە نزیکەوە فەرموودە و شوێنەوار و ئاکارەکان و هەواڵە وردەکان بەچاوی خۆی ببینێ.

هەر لەو گەشتانەدا فەتواکانی خۆی پیشانی زاناکان دەدا، گوێشی دەگرت بۆ ڕەخنە و پوختەکردن و زانینی خاڵە لاوازەکانی.

ئەمە و چەندان سوود و کەڵکی تر لە کردنەوەی مێشکی و شارەزابوون بە عورف و عاداتی وڵاتانی تر و لە ڕێگەیەوە بەئاسانی دەچووە ناو وردەکاری و لقەکانی فیقهـ و بەجوانی لێی تێ دەگەیشت و پەی پێ دەبرد.

سێیەم: ئەبوحەنیفە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) پیاوێکی قسەزان و لە هونەری گفتوگۆدا زۆر بەهێزبووە و هەر لە سەردەمی لاوێتییەوە شەیدای بەرامبەرکێ و گفتوگۆ و میزگرد بووە، زۆرجار دەچوو بۆ بەسرە بۆ ئەو مەبەستە چونکە زۆربەی دەستە و تاقمە ئیسلامییەکان لەوێ بوون، لەگەڵ دامەزرێنەرەکانیان گفتوگۆی کردووە و ڕایەکانی لەگەڵدا تاوتوێ کردووە.

دەڵێن گفتوگۆی کردووە لەگەڵ(٢٢) دەستە و تاقمدا و لە گەورەیشدا هەر بۆ بەرگری لە ئیسلام میزگردی کردووە. تەنانەت زۆر جار لەگەڵ دەهریەکاندا قسەی کردووە کە باوەڕیان بە بەدی هێنەری بونەوەر نییە و ویستوویەتی بەرەو باوەڕهێنان بیانهێنێتەوە ڕووی تێکردوون و وتوویەتی: ئەگەر پیاوێك بێت و بڵێت: من کەشتیەکم بینی، پڕ بوو لەشتومەك، کە شەپۆلە گەورەکانی دەیهێنا و دەبرد و، توندەبایش لەهەموو لایەکەوە، لەم نێوەندەشدا کەشتیەکە بە ئارامی دەڕۆیشت کە هیچ کاپتن و بەلەمەوانێکی لەسەر نەبوو خۆی کاری دەکرد و کەسیش پاڵی پێوە نە ئەنا، کەسیش ڕای نەئەکێشت هەر

به تەنها خۆی دەڕۆیشت و دەهات. خۆ ئەمە جێگای باوەڕەو دەچێتە عەقڵەوە.

دەهریەکانیش هاواریان لێ هەستا و وتیان: ئەمە شتێکە و عەقڵ نایبڕێت و دوورە لە ڕاستییەوە، بە خەیاڵیش ڕاست نییە. لەوێدا پێشەوا (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) وتی: (سبحان الله) ئایا ئەگەر نەچێتە عەقڵەوە کەشتیەك بە تەنها و بێ قوبتان لە دەریادا بێت و بچێت، دەی ئایا چۆن دەبێت بچێتە عەقڵەوە ئەم دونیا گەورە و مەزنە بە هەموو شتە جیاجیاکانییەوە و گۆڕانکاری و کردەوەکانییەوەو فراوانی و بێ سنوریەوە لە دەست کردی زانایەکی دانا و پارێزەر نەبێت.

گفتوگۆ لە مەسەلە بیروباوەڕیەکاندا فیکر و هۆشی کردەوە و بە قووڵی پەی بە شتەکان دەبرد، پاشان بۆ گفتوگۆ لە مەسەلە فیقهییەکاندا بەردەوام لە گەست و گەڕانەکانیدا لە مەککە و مەدینە و شارەکانی تری حیجاز خەریکی بینینی زانایان و دەمەقاڵە و میزگرد لەگەڵیاندا، کە بازاری فیقهی بۆ ئەو مەبەستە بەرپادەکرا، تیایدا هەموو زانایەك بەڵگە و نەزەری خۆی خۆی دەخستە ڕوو.

جا لەم کۆڕ و دانیشتنە زانستیانەدا کۆمەڵێ فەرموودەی دەبیست کە پێشتر نەی بیستبوون، یان ڕووەکانی قیاس کە خۆی لێی بێ ئاگا بورە یان هەندێ لە فەتوای هاوەڵان کە ئەو نەیبیستبوون، هەروەك

پێشتر ئەو فەتوای ئەدا بە پێنەدانی ئەمان بە کۆیلە، تا ئەوە بوو بەرامبەرەکەی ئاگاداری کرد کە عومەری کوڕی خطاب (خوا لێی ڕازی بێت) ڕێگەی داوە بەپێدانی ئەمان بە کۆیلەکان، ئەویش لەو ڕایەی خۆی پاش گەزبوویەوە.

چوارەم: شێوازی دەرس وتنەوەی پێشەوا (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لێکۆڵینەوە بووە و ڕا گۆڕینەوە بووە نەك دەرس وتنەوەی ئاسایی، یەکێ لە مەسەلە فیقهییەکانی ئەخستە ڕوو، لەلای قوتابیەکانیدا، گفتوگۆی حوکمەکەیان دەکرد، هەر کەسە و ڕای خۆی دەخستە ڕوو، ڕووی دەدا لە مەسەلەیەکی قیاسیدا هەموویان لەگەڵیدا بوون، وەك لە (محمد بن الحسن)ەوە دەگێڕنەوە، لە هەندێ حاڵەتیشدا دژی ئیجتیهادەکەی دەوەستانەوە، تا کار دەگەیشتە قیڕە و هات و هاوار، دەنگیان لێ بەرزدەبوویەوە، وەك پێشتر لە مسعری کوڕی کودام.

دوای ئەوەی لە هەموو ڕووەکانەوە لە مەسەلەکە کۆڵینەوە، پێشەوایش لە کۆتاییدا ئەنجامی ئەم گفتوگۆیەی ئەخستە ڕوو کە لە ئاکامی گفتوگۆ و لێکۆڵینەوە پێی گەیشتوون، تا پوختیانەکرد و دواتر هەموو ڕایان دەهاتە سەری و پێی ڕازی دەبوون.

بەڕاستی وانە وتنەوە لەسەر ئەم شێوازە دەبێتە هۆی ڕۆشنبیرکردنی مامۆستاکەش و قوتابیەکانیش و سودەکانیشی بۆ

مامۆستا کەمتر نەبووە لەوەی قوتابیەکان پێی دەگەن. بەردەوامی لەسەر ئەم ڕەوشە زانستییە وای کردبوو لە پێشەوا کە تا مردن ڕۆڵی قوتابیشی ئەبینی لەکاتێکدا کە مامۆستایەکی هەڵکەوتەی مەزنیش بووە، بەو جۆرە زانستەکەی لە پێشکەوتن و گەشەکردنی بەردەوامدا بوو.

هەر کاتێك فەرموودەیەك دەهاتە بەردەستی هەموو هۆکارەکانی ئەو حوکمەی تاوتوێ دەکرد و لەگەڵیاندا لێکۆڵینەوەی دەکرد، پاشان لقەکانی تری لەڕێگەی قیاسەوە پێ دەچواندکە هەمان هۆکاریان تێدابوو، ئەوەش بەڕاستی بە فیقهـ دادەنرێت. هەردەم دەیوت ئەو فەرموودەناسەی کە خەریکی فیقهـ نابێت وەك دەرمانسازێك جۆرەها دەرمان کۆدەکاتەوە و بەلام نازانێت بۆ چ نەخۆشییەکە، تا دکتۆرەکە دێت، بەم شێوەیەش فەرموودەناس لایەنی حوکمەکانی فەرموودەکە نازانێت تا فەقیهێك دێت و ڕوونی دەکاتەوە.

کەواتە قوتابیەکانی مامۆستا، بەس گوێگر نەبوون بەڵکو گفتوگۆکارێك بوون، هەر بەڵێیان نەکردووە بۆ مامۆستاکەیان و بەس لەهەر شتێکدا دەیڵێت، بەلام سێ خاڵی لە قوتابیەکانیدا جێبەجێ دەکرد:

١. هاوكارى مادى دەكردن: لە نەخۆشى و نەهامەتييەكانى زەمانەدا فريايان دەكەوت، تەنانەت ژنى هێناوە بۆ ئەوەى كە پێويستى بە ژن هێنان بووبێت و دەست كورت بووبێت، بۆ هەموو قوتابيەكى بەپێى پێداويستيەكانى دراوى بۆ ناردوون. شەريك دەربارەى پێشەوا دەڵێت: ئەو پياوە دەيبەخشييە قوتابيەكانى لە زانست و زانيارى ئەگەر خوێندكارەكە نەبوويش بوايە، ئەوە خۆى و خێزانەكەشى ئەژياند، هەر كە بەجوانى فێر بوو، ئيتر دەيوت پێى: گەشتيتە دەوڵەمەندى گەورە، بەوەى كە حەڵاڵ و حەرام دەزانيت[٥٢].

٢. دەروونى خوێندكارەكانى خۆى پەروەردە دەكرد: چاودێرى دەكردن، هەر كە هەستى بكردايە يەكێكيان خەريكە زانستەكەيان غرور و لەخۆبايى بوونيان تێدا دروست دەكات، بەهەندێ تاقيكردنەوە خاوێنى دەكردەوەو واى لێ دەكرد كە هەست بكات هێشتا ماويەتى ببێتە زانا و هەڵقەى هەبێت.

ئەگێڕنەوە(ابو يوسف)كە خوێندكار و هاوڕێشى بووە، هەستى ئەوەى تيدا دروست بوو بوو كە ئيتر خۆى ئەڵقەى وانەى سەربەخۆى هەبێت، ڕۆشت جيابوويەوە لە پێشەوا ئەميش وتى بە كەسێك بڕۆ پرسيارێكى لێ بكە، دەربارەى كەسێك شەرواڵەكەى بردووە بۆ لاى خەياتێك تا بۆى قارس بكات و ئەويش دواتر بردوويەتى بۆ خۆى و

---

[٥٢] الخيرات الحسان لا٥١-٤٢.

وتوویەتی تۆ گەرم پێ دەگێڕیت هیچت بۆ نەهێناوم، پاشان لەڕۆژێکی تردا هاتەوە و داوای شەرواڵەکەی کردەوە و خەیاتەکەش دایەوە پێی و بۆشی کورت کردبوویەوە، ئایا شایانی ئەوەیە پارەی قارس کردنەکەی پێ بدات؟

ئەگەر وتی: بەڵێ، بڵێ نەتپێکا و ئەگەر وتیشی نەخێر هەر بڵێ تۆ هەڵەی نەتپێکا، پاوەکەش چو بۆلای و پرسیارەکەی ئاڕاستەکرد، ئەویش وتی: بەڵێ کرێکەی دەکەوێت، پیاوەکە وتی: هەڵەت کرد نایکەوێ، (ابو یوسف)کەمێ بیری کردەوە و پاشان وتی: نەخێر نایکەوێت پیاوەکەش دیسان وتی: نەخێر نەتزانی، هەر لەوێدا (ابو یوسف)هەستایە سەرپێ و ڕۆشت بۆ لای ئەبوحەنیفە و پێشەوایش وتی: بۆ مەسەلەی خەیاتەکە هاتوویت؟ وتی: بەڵێ، تێمبگەیەنە، پێشەوایش وتی: ئەگەر دوای داگیرکردنەکە کورتی کردبوویەوە هیچی ناکەوێت، چونکە بۆ خۆی کورت کردۆتەوە بەڵام ئەگەر پێش داگیرکردنەکە بۆی کورت کردبوویەوە ئەوە کرێکەی دەکەوێت، چونکە بۆ ئەوی کورت کردۆتەوە .

ئەوەش کارێکی پێویست بوو، چونکە ئەو ڕێڕەوەی کە قوتابیەکانی لەسەر ڕاهێنابوو کە لە ڕێگەی گفتوگۆوە وانەی پێ دەوتنەوە، قوتابیەکانی گەیاندبووە ئاستێك کە دەمەقاڵەش لەگەڵ مامۆستاکەیاندا بکەن و ڕای سەربەخۆی خۆیان هەبێت، ئەمەش

دیاره وادەکات له خوێندکارەکه که غرور و لەخۆبایی بوونی تێدا دروست ببێت و ئەمەش گەر بەئاگانەهێنرێتەوه دیاره خۆی لەناو دەبات، بۆیه پێشەوا زۆر ژیرانه تێی دەگەیاند که ئەها هێشتا ماوته جارێ و زانستێکی ئەوتۆتنییه جارێ که بتوانیت هەڵقەی خۆتت هەبێت.

٣. زۆر ئامۆژگاری دەکردن، ڕاسته ڕێگای نیشان دەدان بەتایبەت ئەوانەیان که وەختی جیابوونەوه یان وازهێنان بۆ چوون بۆ کارێکی تر، ئەگەر سەیرێکی(المناقب)ی بەزازی یان مەککی بکەیت نموونەی زۆری تێدایه لەم ئامۆژگاریه بەپێز و جوانانەی بۆ خوێندکارانی، وەك وەسیەتەکەی بۆ(یوسف)ی کوڕی خالدی(السمتی) و (وەسیەتەکەی بوو نوح ی کوڕی (ابن مريم الجامع)) و ئامۆژگاریەکانی بۆ ئەبو یوسف ڕەحمەتی خوای لێ بێتو کەسانی تریش .

بەکورتی پێشەوا ئەبوحەنیفه، سەیری قوتابیەکانی نەکردووه وەك خوێندکار، بەڵکو بەجۆرێ سەیری کردوون که هاوڕێن و گفتوگۆکارێکن بەرامبەری، هەموو ژیانی خۆی پێ دابوون، تەنانەت پێی دەوتن: ((أَنْتُم مَسارّ قَلبي وَ جَلاء حزني)) واته: ئێوه جێگای دڵخۆشی و خەم ڕەوێنمن.



## سەردەمی پێشەوا ئەبوحەنیفە:

* پێشەوا لە ساڵی(٨٠) ی کۆچیدا لەدایك بووە، لە سەردەمی خەلیفەی ئومەوی عبدالملك ی کوڕی مەرواندا و بەچاوی خۆی هێز و دەسەڵات و توندوتیژییەکەی و پاشان لاوازبوون و کەوتنەکەشی بینیون. دەوڵەتی عەباسیەکانیشی بینیوە لە دروستبوونییەوە و بە بەهێزی و دەستڕۆشتنیەوە.

خوێنەر دەبینێ کە پێشەوا لە سەردەمی ئەمەویەکاندا زیاتر ژیاوە تا سەردەمی عەباسیەکان، چونکە (٥٢) ساڵی تەمەنی لەو سەردەمەدا بەسەربرد کە ئەو تەمەنەش تەمەنی پێ گەشتنی زانستی و چڵەپۆپەی فیکری پێشەوا بووەو تەنها (١٨) ساڵ لە سەردەمی عەباسیەکاندا ژیاوە، ئەم تەمەنەش وا لە مرۆڤ دەکات دەست نەبات بۆشتی تازە، کە ئەبوحەنیفە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) گەشتبووە ئاستی بەرزی فیکری و پرۆگرامی زانستی خۆی، لەو تەمەنەدا بەرهەمی زۆری دەبەخشی و هەوڵی دەستکەوتنی زانستی نەئەدا مەگەر بە کەمی.

ناڵێین هەوڵی هەر نەداوە، چونکە عەقڵی مرۆڤ هەر بەتەمای زیاترە و بەتەمای فێربوونی ئەو شتانەیە کە نایانزانێت، بەتایبەت عەقڵ و ژیری زانا دڵسۆزەکان لە سنورێکی ناوەستێ و هەمیشە بەتەمای زیادەن، هەرچەندە بە حوکمی پیری و بەساڵاچوونیان زیاتر

ئەبەخشن لەوەی وەری دەگرن و کاریگەریان هەیە زیاتر لەوەی کاریان تێ بکرێت.

کەواتە ئەتوانین بڵێین: ئەوەی پێشەوا لەسەردەمی ئەمەویەکاندا دەستی کەوت لە زانست زیاتر بوو لەوەی کە لە سەردەمی عەباسی یەکاندا چنگی کەوت.

* ئەو ماوەیەی کە هەردوو سەردەمی ئەمەویەکان و عەباسییەکانی یەکانگیر کردبوو. پێشەوا لەو سەردەمەدا ژیا، لەلایەنی گیانی زانستییەوە بەتایبەت لایەنە دینییەکەی هیچ جیاوازیەکی ئەوتۆیان نەبووە. چونکە سەردەمی عەباسیش درێژە پێدەری سەردەمی ئەمەویەکان بووە لە بواری زانستدا گۆڕانێکی ئەوتۆیان نەبووە، وەك سەدەکان چۆن بەرهەم و کاری سەدەکەی پێش خۆیانن و وەك ڕێگایەك وایە کە تەواوکەری ڕێگاکەی پێش خۆیەتی، گۆڕانی سیاسەتی وڵات کاریگەری نییە لەسەر ڕەوتی پێشکەوتنی زانستی مەگەر لە سنوری زیادە گرنگی پێدان یان پشت گوێ خستن و پەکخستندا. ئیتر خێرابوون و سست بوونی ڕەوتی زانستی پەیوەندی هەیە، ئەو هاوکاریانەی کە دەوڵەت پێشکەشی دەکات یان تەهاون و سستی تێدا دەکات.

چونکە ئەو پێشکەوتنەی کە لایەنی زانستی و کۆمەڵایەتی بەخۆیەوە دەبینێ، ئازایەتی هەمووانە و کاری(جەماعی)یە و دەوڵەت

دەستی نیە تیایدا، مەگەر لە زەمینەسازی و ئاسانکاری یان ڕێگری لە پێشکەوتنی دا.

کۆمەڵێ کەسی دڵسۆز و غەمخۆری دین زانستی هاوەڵانیان وەرگرت و ئەوانیش گەیاندیانە بەرەکانی دوای خۆیان و پاشتر ئەم پێشکەوتنە گەورەیەی بەخۆوە دی و بەجوانترین بەروهەمەوە.

لەگەڵ ئەمانەشدا کە شارستانیەتی نەتەوەکانی پێشوو بوون بە بەشێك لە دەوڵەتی ئیسلامی و، هەموو زانست و پێشکەوتنەکانیان سودی زۆریان بە موسوڵمان گەیاند کە عیلمەکەی خۆی پێ زیاتر پێش بخات ئیتر ئەمان بە ڕاوبۆچوونی جوان، یان فیکرەی نەتەوەکانی تر وەك چۆن لە فارسییەوە دەستیان کرد بە وەرگێڕانی کتێبە نایابەکان وەك عبداللەی کوڕی موقەفەع، کە هەستا بە وەرگێڕانی کتێبەکانی (کلیلە و دمنە) و (الادب الصغیر) و (الادب الکبیر).

ئەمانە هەموو لەسەردەمی ئەمەویەکاندا ڕوویاندا، گەر پێشکەوتنێکیش ببینین لە سەردەمی عەباسیەکاندا هۆکارەکەی ئەوەبوو بە ئاشکرا دەوڵەت هانی خەڵکی دەدا کتێب وەربگێڕن و زانست پێش بخەن، ئەمەش لەبڕی پێشکەوتنەکەی زیاد کرد و ئاڕاستەکەی جوانکرد و جۆرەکەی چاك کرد نەك هەر خۆی داینابێت و دایڕشتبێت.

* که مادەم پێشەوا لە هەردوو سەردەمی ئومەوی و عەباسیدا ژیاوە، پێویست دەکات ئاماژەیەك بکەین بۆ لایەنی سیاسی لە هەردوو سەردەمەکەدا، پاشان ئاماژەش بکەین بۆ کۆمەڵایەتی و زانستی و درێژکردنەوەی بۆ سەردەمی یەکەمی عەباسی و دواتر باسی ئەو مەسەلانەش بکەین کە لەو کاتەدا هۆشی خەڵکی پێوە خەریك بووە کە پەیوەندن بە بیر و باوەڕ یان سیاسەت، یان فیقهەوە.

* با لە لایەنی سیاسییەوە دەست پێبکەین، دیاردەی یەکەم دروستبوونی دەوڵەتی ئەمەویەکان، کە لە دوای دەسەڵاتی چوار خەلیفەکەی پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) هات، کە پێشتر خەلیفە لە باشترین پیاوی موسوڵمانان هەڵدەبژێردرا، لە خەلیفەکەی پێش خۆیەوە دەپاڵێورا، وەك ئەوەی لە خەلافەتی عومەردا ڕوویدا، یان بەبێ پاڵاوتن وەك ئەبوبەکر و عەلی (خوایان لێ ڕازی بێت)، یان بەشێوازێکی ناوەندی لەناو ئەم دوو شێوازەدا وەك هەڵبژاردنی عوثمان (خوا لێی ڕازی بێت).

بەڵام هەر کە دەوڵەتی ئومەوی دروستبوو خەلافەت بوو بە پاشایەکی خۆسەپێن. هەرچەندە دامەزرێنەری ئەم دەوڵەتە کە- موعاویە- بوو خوا لێی ڕازی بێت، کۆمەڵێکی زۆر لە موسوڵمانان پێی ڕازی بوون، بەڵام ئەوانەی دوای ئەو هاتن مافی ئەوەیان نەبوو

ئەو ناوە گەورەیە هەڵگرن و خۆیان بەوە بزانن لە هەڵبژاردنێکی سەربەستانەدا کۆمەڵی موسوڵمانان هەڵیان بژاردوون، جا هەر لەبەر ئەوەش بوو سەردەمە جیاجیاکانی دەوڵەتی ئومەوی پڕ بوو لە ئاژاوە و پشێوی و ڕاپەڕینی چەکدارانە و بێ چەکیش، ئەگەر وەزعەکەش هێور بووبێت بۆ ماوەیەك ئەوە دڵەکان لەناوەوە لە داخ ورق و کینەدا دەکوڵان.

زۆری لەو خەلیفە و ئەمیرانەش لایەنە دینیەکە ڕێگەی لێ نەگرتن کە سزا و ئەشکەنجە و نارەحەتی بەرامبەر بەوانەش بکەن، کە لەدڵی باوەڕداراندا جێگایەکی بەرزی هەیە.

یەزیدی کوڕی موعاویە، نەوەی ئەنصارەکان ڕاپەرینیان دژی ڕاگەیاند، ئەویش شارەکەی پێغەمبەری خوای (صلی الله علیە وسلم) حەڵاڵ کرد بۆ سەربازەکانی بە ئارەزووی خۆیان خراپەکاریان تێدا دەکرد، بەبێ ئەوەی دینەکەیان یان ڕێزی شارەکە وایان لێ بکات کە بەو کارە قێزەونە هەستن.

حسینی کوڕی عەلی کچەزاکەی پێغەمبەری خوا(صلی الله علیە وسلم) لەدژی ڕاپەری و ڕەدی کردەوە کە بەیعەت بە یەزیدی کوڕی موعاویە بدات، سەربازەکانی یەزیدیش بەشێوازێکی دڵڕەقانە خوێنی حوسەینیان ڕشت، بەبێ ئەوەی گوێ بەدین بدەن یان ڕێزی

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بگرن و کچەزاکەی بەناڕەواکەی نەکوژن.

پاشان لەئاخر ساتەکانی دەوڵەتی ئەمەویەکاندا نەوەکانی عەلی و فاطیمە (خوایان لێ ڕازی بێت) ڕاپەڕین و چەکیشیان هەڵگرت دژی دەوڵەتی خەلافەت. ئەوانیش بەشێوازێکی ناخۆش و دڵڕەقانە یەزیدی کوڕی عەلیان شەهید کرد، دواتریش یەحیای کوڕی و دواتریش عبداللەی کوڕی یەحیا. هەرچەندە هەر ئەمەویەکان بەوەوە نەوەستان کە بەرامبەرکێی موحەبەتی(ئال)و بەیت ی پێغەمبەریان(صلى الله عليه وسلم)کرد، بەڵکو لەوە زیاتریش لەسەر مینبەرەکان-لەعنەتیان لە عەلی کوڕی ئەبو طالیب دەکرد پەنا بەخوا-و ئەمەش وەك سوننەیەکی سەیئە بەردەوام بوو، موسوڵمانان زۆر ناڕەحەت بوون بەو کارە، تەنانەت دایکی باوەڕداران (أم سلمە) (خوای لێ ڕازی بێت) نامەیەکی نووسی بۆ موعاویە و سەرزەنشتی کرد لەسەر ئەو کارە و پێی وت: ((إنكم تلعنون الله و رسوله علي منابركم و ذلك إنكم تلعنون علي بن أبي طالب، ومن أحبه، واشهد ان الله ورسوله أحبه)).

واتە: ئێوە لەسەر مینبەرەکانتان لەعنەت دەکەن لە عەلی و ئەوەشی عەلی خۆشی دەوێت، دەی خوا شاهیدە خواو پێغەمبەر عەلیان خۆشدەوێت. ئەو کارەش بەردەوام بوو تا سەردەمی خەلیفە

دادپەروەر عومەری کوڕی عبدالعزیز و ئەویش (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) هەڵیوەشاندەوە و قەدەغەی کرد.

* ئەمەویەکان عەرەبچێتییەکی قێزەونیان دەکرد، هەندێ شتی سەردەمی نەفامیان زیندووکردەوە-کە هەندێکیان چاك بوو- هەندێکیشیان دەمارگیریەکی بێ تامی تێدابوو بۆ غەیرە عەرەبەکان و مافیان پێشێل دەکردن.

لەکاتێکدا کە هەموو موسوڵمانان یەکسانن لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا کەس لە کەس زیاتر نییە، مەگەر بەتەقوا و خواپەرستی و کاری چاکە، بەڵام ئەمەویەکان ستەمێکی زۆریان لە(موالی)غەیرە عەرەبەکان دەکرد، تەنانەت لە مافی شەرعی خۆیان لە غەنیمە و دەسکەوتەکانی جەنگ لەکاتی غەزادا، بەمەش و پێچەوانەی شەرعی خوایان کرد کە لە غەنیمەدا دیاری کردووە.

هەر هۆی ئەمەش بووە کە مەوالی یەکانی بەشداری هەموو ڕاپەرین و شۆڕشەکانیان کردووە و بە ئارەزووی خۆیان نەبووە کە ڕازی بوون بە و حکومڕانەکانی ئەمەویەکان.

وڵاتی گەورەی ئیسلام بەدەست ئاشوب و شەڕ و شۆڕەوە مەوجی ئەدا ئەگەر بە ئاشکرایش ئارام بووبێت لەژێرەوە هەر ئاگرەکەی بڵێسەی دەدا لەژێر خۆڵەمێشەکەوە.

ماوەیەك تێپەڕی و ئاژاوە و ئاشوب نەمابوو، بەڵام لەژێرەوە نەخشەی شاراوە هەبوو، پیلانی پشت پەردە دانرابوو، تا بەشێوەیەکی توندوتۆڵ ڕاپەڕین دروست ببێت، ئەم دەوڵەتە لەناو ببرێت، نەخشە دادەڕێژراو بانگەشە دەکرا بۆ دەسەڵاتی عەباسییەکان.

بەردەوام خانە نوستوەکان لە جووڵەدا بوون، تا ئەوەبوو دەوڵەتی عەباسی هاتەکایەوە و دەوڵەتی ئەمەویەکان لە بناغە دەرهێنرا.

* ئەمە بوو حوکمی ئەمەویەکان. بەشێوەیەکی گشتی کە جەماوەری موسوڵمانانی تورەکرد، خۆ لایەنی چاکیشی زۆربوو لەگەڵ لایەنی خراپەیدا.

کە ئەبوحەنیفەڕەحمەتی خوای لێ بێتهاتە دونیاوە تا تەمەنی(١٥) ساڵیش حوکمی دڵڕەقانە و ستەمکارانەی ئەمەویەکانی دەبینی، هەستی بە ئازارەکان دەکرد، چونکە ئەمیش یەکێ بوو لە مەوالییەکان. بەچاوی خۆیشی دەیبینی کەچۆن دڵڕەقانە مامەڵە دەکرا لەگەڵ دەنگە نەیارەکانی ئال و بەیتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)و نەوەکانی عەلی. بەتایبەت حوکمی حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی کە ستەمەکانی لە سنور بەدەربوو. تەنانەت ئەویش بەدڵ و بەدەم و بە سامان لەگەڵیاندا بوو بۆیە کە شۆڕشەکان

دەکوژانەوە، پێشەوایش توشی هەڵاتن و دەربەدەری دەبوو، ناچار پەنای دەبرد بۆ (بیت الله الحرام).

دەوڵەتی عەباسی هاتەکایەوە و خەڵکی هەناسەیەکی شادیان هەڵمژی، بە سەربەستانە و خۆشحاڵیەوە بەیعەتیان دا بە یەکەم خەلیفەی عەباسی (ابوالعباس السفاح). دەوڵەتی عەباسی زۆر باش بوو، دادپەروەر بوو، باسۆز و بەزەیی بوو، بەڵام ئەمە درێژەی نەخایاند و سەرە هاتە سەر ئەبو جەعفەر مەنسور و بەشێوەی توندوتیژی و هێز وڵاتی دەبرد بەڕێوە، هیچ بەزەیی و چاوپۆشی یەکی نەبوو تاڵاوی دەرخواردی خانەوادەی پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم)دا.

هەموو مامۆستاکانیانی توندی زیندانەکان کرد، بەبێ جەنگیش هەر ئەیکوشتن، وایدەزانی هەر درێژەپێدەری حوکمی ئەمەویەکان بوو، تەنها ناوی دەوڵەتەکە گۆڕابوو، لە ئاکامدا پرشی ئاگری ئەبو جەعفەر (پێشەوایشی گرتەوە و توندی زیندانەکان کراڕەحمەتی خوای لێ بێتتا وەفاتی کرد هەر زیندان بەشی بوو).

* پێشەوا ئەبوحەنیفە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە عیراق دەژیا، ژیان و هەڵقەی وانەکانیشی هەر لە عیراق بوو، شارەکانی عێراقیش چ لە کۆتایی سەردەمەکەی ئومەویدا و دەستپێکی

سەردەمەکەی عەباسییەکان دا جمەی دەهات لە فارسی و ڕۆم و هندی لەگەڵ عەرەبەکاندا دەژیان.

کۆمەڵگەیەکیش ئاوا تێکەڵەیەکی تێدا بێت، بێگومان دوچاری چەندان ڕووداوی کۆمەڵایەتی دەبێتەوە، بوونی ئەو هەمووە نەتەوانە پێکەوە لە دەوڵەتێکدا. دەبێ ڕووداوە جیاجیاکانیش بۆ هەریەکەیان حوکمێکی خۆی هەبێت لە شەرعی ئیسلامدا. شەریعەتی ئیسلامیش گشتگیرە و حوکمی حەڵاڵ و حەرامی بۆ هەموو مەسەلەکان پێیە. ئاسایی تاوتوێ کردنی ڕووداوەکان عەقڵیەتی زانایانی فیقهزانی فراوان دەکرد، مێشکی دەکردنەوە بۆ دۆزینەوەی حوکمی شەرع بۆ مەسەلە نوێیەکان لەڕێگەی گریمانە و پەی پێ بردن و قیاس کردن، کە حوکمی مەسەلە تازە و نەبیستراوەکان دەدۆزنەوە لەڕێگەی حوکمە جێگیرەکانەوە.

* پاشان عیراق لەگەڵ ئامەنەشدا، خاوەنی تایبەتمەندی فیکری هەبوو لەبەر بوونی دەستە و تاقمە زۆر و زەبەندەکان لەعێراقدا. هەر لە عێراقدا شیعەکان هەبوون بە میانڕەو ڕۆچووەکانیانەوە، موعتەزیلە و جەهمیە، قەدەریە، مورجیئە و کەسانی تریش.

کەواتە جووڵەیەکی فیکری بوونی هەبوو، هەر لە کۆن زەمانەوە ئەم وڵاتە شوێنی کێشمە کێشمە عەقڵیەکان بووە.

(إبن أبی حديد) له شەرحی(نەهج البلاغه) دا دەڵێ: بوونی شیعه ڕۆچووەکان له عێراق دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی که شیعەکان له عێراق ژیاون و عێراقیش جیا له پاکی و خاوێنی و وڵاتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)و هاوەڵە نازدارەکانی، پڕ بوو لەکەسانی: شوێنکەوتەی هەوا و ئارەزوو، دەسته و تاقمی جیا و مەزهەبه فیقهییه جوانەکان، خەڵکی ئەم وڵاته خەڵکی زیرەك و چاوکراوه و فیکر وردی و گەڕان بەدوای ڕاوبۆچوونه جیاجیا بیروباوەڕیەکاندا هەر له سەردەمی کیسراکانی وەك مانی، دیسان، مەزدەك و کەسانی تریش.

کەواته ئەو قوڕەی حیجاز زۆر جیاوازبوو لەو قوڕەی عێراق و زیهن و مێشکی حیجازیەکان جیابوو له مێشك و زهنی عێراقییەکان .

* ئەمەیه ئەو عێراقەی که پێشەوای تیا ژیاوه. که کۆتایی سەردەمی ئومەوی و سەرەتاکانی سەردەمی عەباسییەکان بوو. عێراق کانگای ئەو فیکر و بیروبۆچوونانه بوو که دەهاتنه ناو موسوڵمانان و بیروباوەڕی تێك ئەدان، یان گومانیان له دینەکەیان بۆ دروست دەکات.

ئەو تێگەشتنه ساده جوانەی ئیسلام بۆ بیروباوەڕ، تێکەڵیان کردبور به مەسائل گەلێکی عەقڵییەوە که ئەستەمه تێگەیشتنی و زانینی ناوکرۆك و نهێنییەکانی، وەك مەسەلەی قەزا و قەدەر و

ویستی ئازادانەی مرۆڤ کە ئایا سەربەستە لە کردەوەکانیدا کە ئەوەشی مەعقول و مەقبولە یان خۆی هیچی بەدەست نییە لە کارەکانیدا، ئەم گفتوگۆ و دەمەقاڵانە بڵاوبوو بوونەوە لەناو موسوڵمانانندا، لەژێرەوەش بەپلان و نەخشەی ترسناك داڕێژرابوو تا خەڵکی لە دین تێ نەگەن و نەیارانی ئیسلامیش لەو کەلێنەوە لە ئیسلامیان دەدا، دەیان کردە بەربەستێك تا خەڵکی نەیەنە ناو ئیسلام و موسوڵمان نەبن.

تەنانەت لە سەردەمی ئەمەویەکاندا یوحەنناى گاور لەسەردەمی هشامی کوڕی عبدالملك دا، بە وردی گاورەکانی فێردەکرد کە چۆن دەمەقاڵە لەگەڵ موسوڵمانەکاندا بکەن لە مەسەلەی دینەکەیاندا.

لە(التراث الاسلام)دا هاتووە دەڵێ: ((ئەگەر عەرەبێك لێی پرسیت دەربارەی عیسی مەسیح چی دەڵێی؟ لە وەڵامیاندا بڵێن (کلمة الله)یە. پاشان ئێوە لە موسوڵمانەکە بپرسن: ئایا مەسیح لە قورئاندا چۆن باسکراوە؟ هیچ نەڵێ تا موسوڵمانەکە وەڵام دەداتەوە و ئەویش ناچار بڵێ (مەسیح عیسای کوڕی مەریەمە و وشەی خودایە خستوویەتیە دڵی مەریەم و ڕۆحی خۆشێتی))[٥٤].

[٥٤] [إِنَّمَا ٱلْمَسِيحُ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ رَسُولُ ٱللَّهِ وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلْقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِّنْهُ] النساء:١٧١.

تۆش لێی بپرسە: وشەی خوا و گیانی خوا مانای چییە؟ دروست کراوە یان دروست کراو نییە؟ ئەگەر وتی (مەخلوقە) بڵێ خوای گەورە هەر بووە و کاتی خۆی کەلیمە و ڕوحی نەبووە. کە وات وت: موسوڵمانەکە دەم کوت ئەکەیت، چونکە لە دیدی موسوڵمانەکاندا ئەوەی وابڕبکاتەوە (زندیق) و لە ئاین دەرچووە.

پاشان فێری ئەکردن ڕەخنە لە ئیسلام بگرن لە مەسەلەی فرەژنی و تەڵاق و هێنانەوەی خێزان و.. پاشان هەندێ شتی بەدەم پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) هەڵدەبەست و عیشق و عیشبازی لەگەڵ زەینەبی کچی جەحش، پاشان دەیوت ڕێزگرتنی بەردەڕەشەکە لەلایەن موسوڵمانانەوە هیچی جیا نییە لە ڕێزگرتنی مەسیحی لە خاچ.

هەر بەمەوە نەدەوەستا بەڵکو وای ئەکرد لە دەمەقاڵە چییەکان، کە موسوڵمانەکان کێش بکەن بۆ ناو مەسەلەی قەزا و قەدەر و ڕیستی مرۆڤ و سەربەستی ئازادانەی و مەسائیل گەلێکی تریش[٥٥].

ئەم پیاوە گاورەی کە هشام خۆی و باوکی ڕێزی لێگرت و خزمەتی ئەکردن، کە مێشکی موسوڵمانانی تێك ئەدا و دەیکردن بە دەستەو تاقمی جیاجیا و زۆر و زەبەندە کە کێشەی فیکری ئاڵۆزی ئەخستە ناویانەوە، بۆ سەرلێ تێکدانی موسوڵمانان و دروستکردنی

---

[٥٥] (تراث الاسلام)و(المخطوطات العربية(الاب لويس شيخو))

ناكۆكی لەناوياندا، تا ببنە دەستە و تاقمی دژ بەيەك و ئەحزابی فيكريان لیٚ دروست ببێت.

*لە تەنيشت ئەم لێكخشانە فيكريەدا بزوتنەوەيەكی فيكری تر هەبوو، كە هەر لە سەردەمی ئەمەويەكانەوە دەستی پێكرد و لە سەردەمی عەباسييەكاندا بەتەواوی هاتە بەرچاو و ڕۆڵی خۆی بينی، ئەو بزوتنەوەيەش پەيوەندی كردن بوو بە فەلسەفەی یۆنانييەكانەوە، كە وەك وتمان هەر لە سەردەمی ئەمەويەكانەوە دەستی پیٚ كرد.

(ابن خلكان)دەڵێت: ((خاليدی كوڕی يەزيدی كوڕی موعاويە، شارەزاترين كەسی ناو قوڕەيش بووە، لە بواری هونەری عيلم و قسەكردن لەسەر پيشەسازی كيميا و پزيشكی، زۆر شارەزا بوو لەم دوو زانستەدا و ورد و درشتی دەزانی، لە چەندان نووسين و نامەدا ئەمەی سەلماندووە، ئەم پيشەسازيەشی لە پياوێكی ڕوهبان كە ناوی (موريانس الرومی)بوو، لەسیٚ پەيامیدا باسی لەو گفتوگۆ و ڕووداوانەی لەگەڵ(موريانس)وێنەی فێربوونی لەو مامۆستايەوە)).

پەيوەنديەكە زياتر فراوان بوو، گەشتە بزاڤ وەرگێڕان لە فيكری یۆنانی و فارسی و هندی لەسەردەمی عەباسييەكان دا. ئەمەش كاريگەری هەبوو لەسەر فيكری ئيسلامی، ئەم كاريگەريەش لە زۆر لايەنەوە بوو، بەپێی بەهێزی عەقڵ و دينی كەسەكە زياد و كەمی

دەکرد لەسەری، ئەو زانایانەش دوو جۆربوون: جۆرێکیان بەهێز بوو لەلایەن عەقڵ و دینداریە بەهێزەکەیانەوە، ڕووبەڕووی ئەو کۆمەڵە ئەفکارە بوونەوە و مێشك و عەقڵی خۆیانیان پێ بەهێز کرد وەرزشێکی بەهێزبوو بەژیری و مێشکیان.

بەڵام جۆرێکیان خاوەنی دەروونێکی بەهێز نەبوون و لەبەردەم ئەو ئەفکارە هێنراوانەدا خۆیان نەگرتوو، عەقڵی تێك داوون، لەناو بێ سەروبەریەکی فیکریدا دەژیان و لەوانە بینیمان کە شاعیر و نووسەر و بەحیساب زانا، ئەو فیکرانە مێشکی تێك دان و عەقڵیان نەیتوانی هەرسی بکات و سەرگەردان بوون.

بە تەنیشتی ئەمانەشدا–زەنادیقە–هەبوون کە بە ئاشکرا کۆمەڵە ڕاوبۆچوونێکی تێکدەرانەی کۆمەڵی موسوڵمانانیان هەڵگرتبوو، خەریکی هەندێ فیکرە بوون کە ڕوخێنەر بوو بۆ فیکری ئیسلامی، لەوانە هەندێکیان ئەیانویست ئیسلام لە حوکمڕانی جیابکەنەوە، زیندووکردنەوەی حوکمی فارسە کۆنەکان وەك ئەوە موقنەع الخوراسانی کە لە سەردەمی عەهزی مهدیدا لە دەوڵەت هەڵگەڕانەوە لە دەوڵەتی عەباسی.

* ئەم هۆکارانەی پێشوو بوونە هۆی ڕوودانی کێشمە کێشمی فیکری و بەگژاچوونەوەی نێوان ڕاو بۆچوون و بیروباوەڕە دژ بە یەکەکان.

ئەگەر ئەبوحەنیفە (ڕەحمەتی خوای لیٚ بێت) لەم سەردەمەدا ژیابێت و لە عێراقیشدا کە کانگای شەڕ و بەرامبەرکیٚ فیکریەکان بوو، بیگومان ئەمیش کەوتۆتە ئەو وەزعەوە، وەك موسوڵمانێکی تێگەیشتوو لە دینەکەی و بەربریکار لە ئیسلام لەگەڵ دەستە و تاقمە جیاجیاکانەوە.

لە قسەکردنی لەگەڵ دەستە و تاقمە جیاجیاکاندا ڕایەکی زانراو و پلەیەکی بەرزی هەبوو و بە هەموویانەوە ڕاوبۆچوونەکانی ئەبوحەنیفەیان پێك هێنابوو.

*** لەنێوان ئەم جەنگە فیکرییەدا و جۆری کارتێکردنی لەو زانا فیقهی گەورەیە، جا با وشەیەك لەلایەنی زانستە ئاینییەکانەوە لەو سەردەمەدا بخەینە ڕوو:**

زانست و زانیاری لە سەرەتای ئیسلامەوە، پشتی بە بیستن دەبەست، بەڵام هەر کۆمەڵیٚ لە خەڵکی ڕوویان کردە زانستە جیاجیاکان و باسیان دەکرد و لەسەری وانەیان دەخوێند، زاناکانیش لەم سەردەمەدا دەستیان کرد بە نووسینەوە و زانستی ئیسلامی و زانستی عەرەبی هەڵکەوت و هەر زانستە کۆمەڵە زانایەکی بۆ هەڵکەوت و تایبەتمەندیان تێدا دەستکەوت و بنەماکانی نووسیەوە، لە کۆتا ڕۆژەکانی سەردەمی ئەمەویەکاندا زانا فیقهی و زانا فەرموودەناسەکان دەستیان کرد بە نووسینەوەی فەرموودە و فیقهـ.

زاناكانی حیجاز دەستیان كرد بە كۆكردنەوەی فەتواكانی عبداللەی كوڕی عومەر و عائیشەی دایكی باوەڕداران، عبدالله ی كوڕی عەباس -خوایان لیّ ڕازی بێت. دوای ئەوانیش زانا گەورەكانی تابعین لەشاری مەدینەی پڕ لەنوور، لەو فەتوانە وورد ئەبونەوە و حوكمی تازەیان لیّ هەڵدەگۆست، لقی تازەیان لیّ دەكردەوە، عێراقییەكانیش دەستیان كرد بە كۆكردنەوەی فەتواكانی عبداللەی كوری مەسعود و دۆسیە دادوەریەكانی عەلی و فەتوا و دۆسیە داوەریەكانی قازی شورەیح و سەرجەم قازیەكانی كوفە، ئەوانیش وەك حیجازیەكان دەستیان كرد بە دەرهێنانی حوكمی نویّ، هەر كە سەردەمی عەباسیەكان هاتە كایەوە دونیای نووسینەوە فراوانتر بوو لەبواری فەرموودەدا و ڕیزبەندی فیقهی كرا.

نەك هەر ئەوان، بەڵكو شیعەكانیش دەستیان كرد بە نووسینەوە، هەندیّ نووسینی مێژوویی لە میلانۆ ئەوەی دەرخست كە ڕەشنووسێك هەیە دەدرێتە پاڵ یەزیدی كوری عەلی كە لە ساڵی(١٣٢) ی كۆچی شەهیدكرا. دەربارەی فیقهـ بوو، كە دەڵێن ئەو كتێبەیە كە دراوەتە پاڵ ئەو ئیمامە، ئیتر ئەگەر ئەم زانیاریە ڕاست بێت یان نە، خۆ شیعە زەیدیەكان لە سەردەمی ئەبوحەنیفەدا ڕاوبۆچوونی خۆیانیان هەبووە و پێشەوایش ڕای خۆی هەبووە لەسەریان، لە ژیانەكەیدا ڕوون بوویەوە، كە پەیوەندی هەبووە

لەگەڵ زیدی کوڕی عەلی (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) و پەیوەندی زانستیشی هەبووە لەگەڵ جەعفەری صادق و محمد باقر، بێگومان ئەویش لە فیقهی زەیدی یەکان و پێشەواکانی ئیمامییەوە و دوانزە ئیمام و ئیسماعیلیەکان شارەزایی باشی هەبووە.

* ئەو سەردەمەش سەردەمی بەرامبەرکێ و میزگرد بوو، گفتوگۆکان زۆر توندوتیژ بوون، زۆر کاریگەری هەبوو لەنێوان دەستە و تاقمە جیاکان و زانایانی ئەهلی جەماعە، لەنێوان خەواریجەکان و کەسانی تردا. ئەوانەشی پێیان دەوتن ئەهلی ئەهواو بەگشتی و نێوان موعتەزیلەکان. نێوان بەرگریکاران لە بیروباوەڕی ئیسلامی و عەقیدەی دروست و ڕێك و ڕاست. زاناکان لەپێناو ئەم میزگرد و گفتوگۆیانەدا ڕۆشتوون بۆ شارەکانی تریش و پێشەوایش وەك باسمان کرد نزیکەی(٢٤) جار چووە بۆ بەسرە دەستە و تاقمە جیاجیاکانی بینیوە و گفتوگۆی لەگەڵ کردوون و هەندێ لە زانا بەسرەییەکانیش بۆ هەمان مەبەست چوون بۆ کوفە.

زیاتر میزگرد و گفتوگۆکان لە وەرزی حەجدابووە، کە زاناکان لەوێ یەکتریان بەئاسانی بینیووە، ئەوەتا ئەبوحەنیفە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە مەککە چاوی کەوتووە بە ئەوزاعی و مالیك لە حیجاز، گفتوگۆ و دەمەقاڵەکانیان زۆر بەسود و بەرهەمدار بووە، زۆر سودمەندانە تربوو لە گفتوگۆکانی دەستە و تاقمە جیاجیاکان.

**دەمارگیری لە گفتوگۆکاندا:**

هەندێ جار گفتوگۆکان دەمارگیری و تەرەفگیری شارەکانی خۆیانی تیدابووە، بەسرەییەکان لەگەڵ کوفییەکان دا و هەر لایە و ویستویەتی شارەکەی خۆی سەربخات وشکست بە شارەکەی بەرامبەری بهێنێت، نموونەیەك لەسەر ئەمە بخەینە ڕوو:

جارێکیان بۆ یەکەم جار یوسفی کوڕی خالد (السمتی)، لەگەڵ ئەبوحەنیفەدا یەکتریان بینی وەك لە(مناقب)ی (البزازی) دا هاتووە دەڵێ: هیلالی کوری یەحیای (الرأی) دەڵێت: لە یوسفی کوری خالدم بیست کە دەیوت: من جاربەجار سەردانی (عثمان البتی) بوو لەسەر مەزهەبی حەسەن (المعتزلی) دەڕۆیشت لەگەڵ ئیبن سیرین، منیش ئەو مەزهەبەم وەرگرت لێیان و گفتوگۆشم لەگەڵ ئەوانی تر دەکرد لەسەری، پاشان مۆڵەتم دەخواست و دەچووم بۆ کوفە بە مەبەستی گفتوگۆ و لێکۆڵینەوە لەگەڵ زاناکان و مەزهەبەکانیاندا و گوێ گرتن بۆ ڕاوبۆچوونەکانیان، گەشتمە ئەوێ (سلیمان الاعشمیان) بۆ دەستنیشان کردم، چونکە زیرەکترینیان بوو لە فەرموودەدا و منیش کۆمەڵێ مەسائیلی فەرموودەم لەبەردەستدا بوو، پرسیارم لە زۆرێ لە فەرموودەزانەکان کرد، بەڵام وەڵامێکی ئەوتۆم دەست نەکەوت لێیان، لە ھەڵقەکەی ئەعشەمدا ئەو قسەیەك کرد و ئەویش وتی: ئا ئەو کەسەم بۆ بێنن، منیش نزیك بوومەوە لێی، وتی: لەوانەیە

ئەتەویٚ بڵێی خەڵکی بەسرە لە خەڵکی کوفە زاناترن، نەخێر سوێند بە ڕەبی کەعبە، وانییە، بەسرە تەنها زانای چیرۆك و خەوپەرژین و شیوەن گێڕی پێشکەش کردووە، سوێند بەخوا لە کوفەدا هەیە عەرەب نییەو غەیرە عەرەبە و کەچی کۆمەڵە مەسەلەیەکی فەرموودە دەزانێت کە حەسەن سیرین و قەتاتە و(البتی)نایزانن..

زۆر زۆریش تورەبوو بەجۆری ترسام عەساکەی بکێشیٚ بەسەرمدا، پاشان یەکی لەو کەسانەی لەلای بوون وتی: بیبەن بۆ هەڵقەکانی نوعمان(ئەبوحەنیفە)، وەڵامی بچوکترین قوتابیشی وەڵامی جوان و دروستی لەلایە بۆ پرسیارەکانی ئەم کابرایە، مەگەر خوا بزانێت چەنیٚ ترسی چووە دڵمەوە. پیاوەکە هەستا و منیش کەوتمە دوای کە لە مزگەوت هاتینە دەرەوە پێی وتم: ئەبوحەنیفە لە ناوچەی (بنی حرام)ە و پرسیاری بکە و بچۆ بۆلای ئەو لە زانستی فەرموودەدا زۆر زانایە.من ئێستا کارێکم هەیە و ناتوانم لەگەڵت بێم بۆ لای.

دەڵیٚ: منیش هۆز بە هۆز پرسیارم کرد تا لەئاکامدا گەشتمە (بنی حرام)و کاتەکەش عەسر بوو، پیاوێکی بەساڵاچوو هات بەپیرمەوە، ڕوویەکی جوان و جلی ڕێکوپێك و کوڕێکی لەگەڵدابوو زۆر لەخۆی دەکرد و کە نزیك بوویەوە سڵاوی کرد، سەرکەوتە سەر منارەکە و بە دەنگێکی خۆش بانگی دا، وتم بشیٚ و نەشیٚ ئەمە نوعمانە.

پاشان دابەزی دوو ڕكات نوێژی كرد كە لە نوێژی حەسەنی بەسری و ابن سیرین دەچوو، كۆمەڵێ لە هاوڕێكانی كۆبوونەوە و خۆی چووە پێشەوە و پێشنوێژی بۆ كردن وەك نوێژی خەڵكی بەسرە، پاس ئەوەی سڵاوی دایەوە و پاڵی دایەوە بە میحرابەكەوە و ڕووی كردە خەڵكەكە و سڵاوی لی كردن، هەركەسە و چ پرسیارێكی هەبوو لێی كرد، تا سەرە هاتە سەر سەرەی من.

ڕووی تیكردم و وتی: وادیارە غەریبی و خەڵكی بەسرەیت و ڕێگریت لێكراوە كە بەشداری هەڵقەكانی ئێمە بكەیت! ؟وتم: ڕاستە وایە.

وتی: ناوت چییە؟ منیش ناوی خۆم و باوباپیرم پێ وت. پاشان لە كونیە و نازناوم پرسی و منیش پێم وت. دواتر وتی: تۆ بەشداری هەڵقەو وانەكانی (البتی) دەكەیت؟ وتم: بەڵێ. وتی: ئەگەر منی بدیایە لەزۆرێ لە ڕاكانی وازی دەهێنا.

ئادەی چ پرسیارێكت هەیە فەرموو بیكە: تۆ هەستی ترس و تێكچوونێك لە دەم و چارتا بەدی ئەكەم و وێنەی كەسێكی تێكەیشتووی وەك تۆ ئاساییە سەرسامی ڕووی تێ بكات. پاشان كۆمەڵێ پرسیارم لێ كرد و ئەویش وەڵامی دەدامەوە، ئەوەی لەنێوان من و ئەعمەشدا ڕووی دا بۆم گێڕایەوە. ئەویش وتی: خوا بتپارێزێت (ئەبو محمد)، ئەگەر (ابن سیرین) و (حەسەن) پیاو چاك

بن هەریەکەیان دەربارەی ئەوی تریان شتی وایان وتووە کە قسەکەی ئەعمەش بەڕاست بزانرێت.

(ابن سيرين)ڕەخنەی لە(حسن المعتزلی)هەبوو کە دیاری لە دەسەڵات داران وەردەگرت و شتی مەحاڵ زۆر ئەگێڕێتەوە، بە هەواو ئارەزوو قسە دەکات، دەربارەی قەدەر بە جۆرێ قسە دەکات وەك بڵێ خوایەکە لەسەر زەوی دەستی دەڕوات بەبێ پەروەردگارەکەی -پەنابەخوا-، ئەمەی زۆر جار دەوتەوە تا جارێك (خالد الحزاء) هەستایە سەرپێ و وتی: دەی باشە (ابن سيرين)بەس باسی ئەو پیاوە بکە، ئایا ئەو ساڵەی چوو بۆ حەج تەوبەتان پێ نەکرد؟خوایش لە تۆبەکار خۆش دەبێت، ئەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نەیفەرمووە: ((لاتعيروا أحداً بِما كان من الكفر، فان الإسلام يهدم ما قبله من الشرك)) واتە: کەس عەیبدار مەکەن بەبێباوەڕی پێشووی، چونکە ئیسلام لە گوناهـ و هاوبەش پەیداکردنی پێشتر خۆش دەبێت.

پاشان قسەکەی خالدی بە دڵ نەبوو، بۆیە وتی: (محمدی کوڕی واسیع)ی کوڕی قەتادە و(ثابت البناني) و (مالك)ی کوڕی دینار، هیشامی کوڕی حیسان، ئەیووب، سەعدی کوڕی عورووبە و کەسانی تریش وتوویانە کە حەسەن لە(قەدەر) تەوبەی نەکردووە تا مردن.

کەچی عەمری کوری عوبێد و واصل ی کوڕی عەتا، غیلانی کوڕی جەریر و یونسی کوڕی بەشیر بانگی خەڵکیان دەکرد بۆ مەزهەبەکەی حەسەن، هەموو بەسرەش بەم شێوەیە بەردەوام بوون.

حەسەنیش دژی (ابن سیرین) قسەی کردووە و دەڵێ: لە گۆزەدا دەستنوێژی دەگرت و بەیانیانیش بە دولکە دولکە دەستنوێژی دەکرد، کە بەم کارەی سزای خۆی دەدا و پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) کردووە، خەو پەرژین دەکات وەك بلێی لە بنەماڵەی یەعقوبە (سەلامی خوای لێ بێت).

وەرە پێشەوە بزانم بۆچی هاتوویت–واز لەم قسانە بهێنە– ئەو شتانە ئەزانیت کە نابێت نەیزانیت، ئوممەتەکانی پێش ئێوە یەکڕا نەبوون و ئێوەش ناتوانن یەکڕابن، چونکە خوا فەرموویەتی:﴿ وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ ﴿١١٨﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ ۚ وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ﴾ هود: ١١٨–١١٩.

واتە: بەردەوام ڕایان جیاواز دەبێت مەگەر ڕەحمی خوا، خوایش بۆ ئەوە دروستی کردوون.

ئەگەر قەدەر شتەکانی دیاری نەکردایە و هەڵسوکەوتەکان جیاوا نەبونایە، هەرگیز جیاوازی ڕووی نەنەدا، بەڵام ﴿ قُلْ كُلٌّ يَعْمَلُ عَلَىٰ شَاكِلَتِهِۦ فَرَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَنْ هُوَ أَهْدَىٰ سَبِيلًا ﴿٨٤﴾﴾ الإسراء:٨٤.

پاشان بێ دەنگ بوو، پاشان لێم پرسی: تۆ چی دەڵێی لەسەر ئەو جیاوازیەی لە مەسەلەی قەدەردا هەیە؟ پێشەوایش (بە ڕەحمەت بێت) وتی: خەڵکی بەسرە و کوفە لە قەدەردا ڕای جیاوازیان هەیە وەك دەزانیت، ئەم مەسەلانەش قورسن لەسەر خەڵکی و چۆن ئەتوانن پەی پێ بەرن، ئەم مەسەلەیە قوفلێ دراوە و قوفڵەکەشی وون بووە و ناکرێتەوە، مەگەر خوا خۆی بە وەحی ڕوونی بکاتەوە و بە بەڵگەوە و ئەوەش مەحاڵە وەحی بێتە خوارەوە جارێکی تر، ئەوەی ئێمە دەیڵێین ڕایەکی ناوەندە لە نێوان هەردوو ڕاکەدا، دەڵێین: نە زۆرکاری هەیەو نە سەرپشککردن و نە سەپاندن، خوای تەعالا شتێ نادات بەسەر بەندەکانیدا کە نەیتوانن، شتێکی ناوێ لێیان کە نایزانن، سزاشیان نادات لەسەر ئەو شتەی کە نەیان کردبێت و پرسینەوەشیان لەگەڵ ناکات لەسەر شتێك کە نەیان کردووە.

خوا لە ئێمە باشتر خۆمان ئەناسێت، ئەوە شتی ڕاستتر لای ئەوە و ئێمە تەنها کۆشش دەکەین و هەر کۆششکەرێکیش پێکاویەتی، هەرچەندە داوای کۆششی لێ نەکردوون لەو مەسەلانەدا کە نەیانزانیوە، خوای گەورە ئاگای لەهەموو چیو ورێکە، تەنها ئەویشە ڕەغبەتی ڕەغبەتداران، خوای گەورە ئێمەش و تۆش بخاتە سەر ڕێگاکەی کە خۆی پێی خۆشە.

* ئەم بەسەرهاتەشمان بۆیە بە دوور و درێژی باس کرد، تا دەرکەوێت کە ناوچەگەرێتی و شارچێتی لەو سەردەمەدا ڕۆڵی هەبووە لە جیاوازی بیروڕاکاندا، هەر شارە و زاناکانی خۆی بەڕاست زانیوە و جیاوازی ڕاوبۆچوونی زانایان دەردەخات، کە تا چ ئاستێك دابەزیونەتە سەر ڕێڕەو و پرۆگرامی یەکتر، کە لەکاتێکدا پیاو چاك و ناوداری ناو موسوڵمانان بوون، هەروەك مەزنی بیرکردنەوەی پێشەوا ئەبوحەنیفە دەردەخات کە چۆن لەگیانی سەردەمەکەی و ڕای زاناکان تێگەیشتووە و نەفسیاتی خوێندوونەتەوە، بیروباوەڕی سەربەخۆی خۆی هەبووە، جیابووە لەو هەموو ڕێچکە و ڕاوبۆچوونە جیاجیایانە، بەشارەزایی و وردی پشکنیوونی و لەناو ئەو هەمووە ڕێگایانەدا لێی تێك نەچووە و گومڕا نەبووە، لەسەرووی بیر و فیکری ئینسانییەوە بیری نەکردۆتەوە، چونکە قەدەر مەسەلەیەکە چەندان کەسی گومڕا کردووە و قوفڵێکە کلیلی وون بووە.

* ئا ئەمانە بوون ڕێگا و ئاڕاستە فیکری و کۆمەڵایەتییەکانی سەردەمی پێشەوا ئەبوحەنیفە، کە بەشێوەیەکی گشتی باسمان کرد، هەندێکیان پێویست دەکات درێژەی زیاتری پێ بدەین و مافی خۆی پێ بدەین، بەتایبەت ئەو مەسەلانەی پەیوەستن بە فیکر و بیرکردنەوەی پێشەواوە و یان ئەو مەسەلانەی پەیوەندیان بە

کۆششە فیقهییەکانی ئەوە هەیە. بەتایبەت مەسەلەی دەربڕینی ڕاوبۆچوون، یان دەست گرتن بە فەرموودە و پاش ماوەی هاوەڵان کەبووەتە جێگای دەمەقاڵەی نێوان زانایان.

## نێوان سوننەت و ڕاوبۆچوون

هەر لە سەردەمی وەفاتی پێغەمبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) تا سەردەمی پێشەوا (الشافعی) زاناکان دوو جۆر بوون: هەندێکیان بەوە ناسرابوون کە بەزانای (ڕاوبۆچوون) بوون. هەندێکیشیان بە دەست گرتن بە فەرموودەوە و بەس، لە سەردەمی زانا و فەقیهەکانی ناو هاوەڵاندا (خوایان لێ ڕازی بێت) هەر بەو جۆرە هەندێکیان ناسرابوون بە زانای ڕەئی و بۆچوون، هەندێکیشیان بەگێڕانەوەی فەرموودە ناسرابوون، تەنانەت زانایانی تابعین و تابعی تابعین یش هەر بەو چەشنەبوون، پاشان پێشەواکانی کۆشش وەك: (ئەبوحەنیفە و مالك و شافعی و احمد) (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) جا با بەکورتی لەسەر ئەم دوو جۆر ڕایە بدوێین.

(الشهرستانی) لە (الملل والخل)دا دەڵێت: ئەو ڕووداوە و پێشهاتانەی لە پەرستشەکان و هەڵسوکەوتەکاندا دێنە پێش لەژمارە نایەت و زۆرن، بە تەواویش ئەوە ئەزانین کە بۆ هەموو ڕووداوەکان دەقی قورئان و فەرموودە نییە و ئێ شتی واش ناچێتە عەقڵەوە، کە

دەقەکان سنوردارین و کەچی پێشهاتەکان سنوردارنەبن، سنورداریش ناتوانێت بێ سنور کۆنترۆڵ بکات. بەمەش کۆشش-الاجتهاد-و بەراوردکاری-القیاس- شتێکی حەتمی و پێویست دەبێت. بۆ ئەم مەبەستەش هاوەڵان دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ڕووبەڕووی دنیایەك ڕووداو و پێشهاتەی نوێ بوونەوە. ئەوانیش هەموو ئەو شتانەیان دەدایە بەر ڕۆشنایی قورئان ئەگەر ئایەت لەو بارەوە هەبوایە. ئەگەر نەشبوایە بە دەقەکانی فەرموودەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چارەسەریان دەکرد.

ئەگەر ئەو دوو دەقە نەبوو. دەستیان دەکرد بە بەکارهێنانی مێشکیان و ڕای خۆیان بەکاردەهێنا. هەروەك دادوەرەکانی ئەمڕۆ کە دەقێکی یاساییان لە مەسەلەیەکدا لەبەردەستدا نەبوو ئەوە حوکمەکە بەجۆرێ دەدات کە ڕای وابێت لە دادپەروەری و ڕاستییەوە نزیکە.

هاوەڵان لەسەر ئەم ڕێڕەوە بوون، نامەکەی عومەری کوری خەتتاب(خوا لێی ڕازی بێت)بۆ (ابو موسی الاشعری) و پێی وت: ((الفهم الفهم فیما تلجج في صدرك مما لیس في کتاب ولا سُنة، اعرف الأشباه و الامثال و قس الامور عند ذلك)) واتە: ((جوان تێبگە لەو شتانەی کە نە قورئان و نە فەرموودەیان لەسەر هاتووە، بە زانینی

هاوشێوه و هاو وێنەکانی و پاشان مەسەلەکانی لەسەر-قیاس-و بەراوردکاری بکە)).

* هاوەڵان (خوایان لێ ڕازی بێت) هەموویان بە ڕاوبۆچوون کاریان کردووە، بەڵام هەریەکە و بەڕێژەیەك، هەندێکیان زۆر زۆر و هەندێکیان زۆر بەکەمی، ئەمەش لەکاتێکدا کە لەو مەسەلانەدا ئایەت و فەرموودەی لەسەر نەهاتبێت. لەڕاستیدا هەر هەموویان (خوایان لێ ڕازی بێت) لەسەر ئەوە یەك بوون کەدەبێ بەئایەت و فەرموودەکان کاربکرێت و ڕاوبۆچوون بەکارنەهێنرێت ئەگەر ئایەت یان فەرموودەی-صحیح-ی لەسە هاتبێت، ئەگەر لە مەسەلەکەدا ئایەت و فەرموودە نەهاتبوو ئەوە زانا ناودارەکانیان کاریان بە-ڕاوبۆچوون-دەکرد.

هەندێ لە هاوەڵان لەبەر ئەوەی دڵنیانەبووە لە لەبەرکردنەکانی خۆی بۆ فەرموودەکان یان فەتوایەکی پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) وای بەباش زانیوە کە ئەو فەرموودانە نەگێڕێتەوە و ڕاوبۆچوونی خۆی بەکارنەهێنێ لەسەریان و فەتوا نەدات، ئەمەش لەترسی ئەوەی نەبادا بەدەم پێغەمبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) درۆیەك بکات.

وەك (عمران ی کوڕی حەصین) (خوا لێی ڕازی بێت)دەڵێت: ((سوێند بەخوا ئەتوانم دوو ڕۆژ لەسەر یەك بەبێ وەستان فەرموودە

بگێڕمەوە، چونکە منیش وەك ئەوانەی دەیگێڕنەوە گوێم لێ بووە و لە حزووری پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) بووم کاتێ فەرموویەتی، بەڵام بۆیە کاری واناکەم چونکە کەسانێك دەبینم لە هاوەڵانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کۆمەڵە فەرموودەیەك دەگێڕنەوە لە پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) کە وانین، منیش ترساوم بکەومە نێو ئەو هەڵانەی ئەوانەوە.

(أبو عمرو الشیبانی) دەڵێت: یەكساڵ لە خزمەت عبداللهی کوڕی مەسعود دابووم گوێم لە فەرموودە دەگرت، نەیدەوت: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی، بەڵکو کە دەیوت: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی، یەك موچڕکەی پیادەهات و دەیوت: یان ئاوای فەرمووە، یان نزیك لەمە یان شتێك لەمە)).

عبدالله ی کوڕی مەسعود (خوا لێی ڕازی بێت) لەو مەسەلانەدا فەتوای دەدا و ڕای خۆشی بەکاردەهێنا، بەڵام ئۆباڵەکەی ئەگرتە ئەستۆی خۆی ئەیوت: ((ئەمە ڕای منە، ئەگەر تەواو و دروست بێت لە خواوەیە و ئەگەر ناڕاست و نەشم پێکابێ ئەوە لەخۆمەوەیە و لە شەیتانەوەیە)).

لەخۆشیاندا خەریك بوو دەفڕی کە دواتر بۆی دەردەکەوت لەسەر ڕایەکەی فەرموودەیەك هەیە و بۆیان دەگێڕایەوە، وەك ئەوەی لە مەسەلەی (مفوضة)دا، واتە: ئافرەتێك خۆی دابێتە دەستی پیاوێك

بیدات بەشوو، ئەویش فەتوای دا کە مارەییەکەی مارەیی هاوشێوەکانیەتی–مهر المثل–و دواتر هەندێ لە هاوەڵان شایەتیان دا کە پێغەمبەری خوایش (صلی الله علیه وسلم) هەر بەم شێوەیە حوکمی کردووە لەو مەسەلەیەدا.

بەڵام لایەنی دووەم بەوانەیان دەوت کە بە ڕاوبۆچوونی خۆی کاردەکا و دەهێنا: بەڕاستی لەخۆیانەوە لەدینی خوادا قسە ئەکەن و لەسەر ڕێڕەوی قورئان و فەرموودە نین.

لەڕاستیدا هاوەڵان لەنێوان دوو بەرداشی ئاینیدا بوون یەك لە یەك (موحریج) تر بوون:

یەکەم: فەرموودەی زۆر لە پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) بگێڕنەوە، تا خەڵکی فەرمانەکانی ئاینی ئیسلام بزانن و جێبەجێی بکەن بەسەر ڕووداو و پێشهاتەکاندا، ئەمەش لەترسی ئەوەی خەڵکانێك لەخۆیانەوە فەرموودە هەڵنەبەسن.

دهلوی لە(مجه الله البالغه)دا دەڵێ: ((کاتێ عومەر (خوا لێی ڕازی بێت) کۆمەڵێ پیاوی نارد بۆ کوفە و پێی وتن: ئێوە ئەڕۆنە کوفە و کەسانێك ئەبینن و دەنگی قورئان لە سینەیانەوە دەردەچێت و دەربارەی فەرموودە پرسیارتان لێ دەکەن، فەرموودەی کەم بگێڕنەوە بۆیان)).

دووەم: بەڕاوبۆچوونی خۆیان فەتوا بدەن لەمەسەلە گەلێکدا کە لە پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) شتێکی لەو جۆرە ڕیوایەت نەکرابێت، ئەمەش باس لە حەڵاڵ و حەرام دەکات بەڕای خۆیان، لەوانەش هەندێکیان لەکاتی گێڕانەوەی فەرموودەدا لایان نە ئەدا بۆ ڕەئی، تیایشیاندا هەبووە کەڕای دەربڕیوە ئەگەر ئەسەری فەرموودە لەو بارەیەوە نەبووبێت، هەر کاتێك فەرموودەیان پێ گەشتبێت لەڕاکەی خۆیان پاشگەزبوونەتەوە، زۆرێ لە هاوەڵان ئەمەیان بەسەرهاتووە و (عومەر)یش یەکێ بووە لەوانە.

* لەدوای هاوەڵانیش (شوێنکەوتوانیان) -تابعین- لە سەردەمی ئەواندا دوو شت ڕووی دا:

یەکەم: موسوڵمانان بوون بە کۆمەڵە دەستە و تاقمی جیاجیاوە، جیاوازیەکان زۆر توند بوو بوو، نێوانیان زۆر ناخۆش بوو، ئاسان بوو لەلای هەر تاقمێك کە تاقمەکانی تر بە فاسق و بێ باوەڕ و سەرکەش بدەنە قەڵەم، تیری مەرگیان ئەگرتە یەکتری و کار دەگەشتە شمشێر هەڵکێشان لە یەکتر، ئوممەتی ئیسلام بوو بوو بە شیعە، خەواریج و ئەمەری و بێدەنگەکان کە بەو نەهامەتییە ڕازی بوون کە بە سەریان هاتبوو، لەفیتنە و ئاشوبەکە خۆیان بەدوور دەگرت و دەستیان

تێکەڵ نەدەکرد، خەواریجەکان بریتیبوون لە کۆمەڵێ دەستەوتاقم لەوانە: ئەزاریقە، ئەبازیە، نەجدات وچەندان چەندان ناوی تریش.

شیعەکانیش هەروەها بریتیبوون لە کۆمەڵە دەستە و تاقمێك کە هەندێکیان لە ئیسلام چووبوونە دەر ئەگەر ڕۆژانێك تێی هاتبن، هەندێکیشیان بەو نیازەوە هاتبوونە ئیسلام کە ئیسلام لەبەرچاوی خەڵکی تێك بدەن و گرنگ نەبوو لەلایان دین کۆڵەکەی بمێنێ یان نا، ئەوەی بەلایانەوە گرنگ بوو هەڵوەشاندنەوەی ئیسلام بوو لەبناغەوە، تا ئیمپراتۆریەتە لەناوچووەکەیان بۆ بگەڕێتەوە، یان بەلایەنی کەمەوە تۆڵە بسەننەوە لەوانەی دەسەڵاتیان لە بناغە هەڵکەند، یان وابکەن موسوڵمانان هەمیشە لەناو تاریکایی ئاژاوەدا ژیان بەرنەسەر و نور و ڕوناکی خوا بکوژێننەوە.

لەگەڵ ئەمەشدا، ئەنجامێکی تری لێ کەوتەوە، لەخوا ترسان و ڕێزگرتن لە پرنسیپەکانی ئیسلام لە دڵی خەڵکیدا کەم بوویەوە و فەرموودە هەڵبەستن بەدەم پێغەمبەرەوە(صلى الله عليه وسلم) تەشەنەی کرد، تا کارەکە گەشتە ئەوەی زیرەی کرد بە باوەڕداران، هاتنە مەیدان و بۆ لەناوبردنی ئەو هێرشەی سەر فەرموودە و کەشفیان کرد بۆ هەموو خەڵکی، عومەری کوڕی عبدالعزیز بیری کردەوە لە نووسینەوەی فەرموودە صەحیحەکان و خوێندنیان و

جیاکردنەوەی فەرموودە دروستەکان لە فەرموودە هەڵبەستراو و لاوازەکان.

دووەم: مەدینەی مونەوەرە–شارەکەی رسول الله(صلى الله عليه وسلم) دەسەڵاتی زانستی کەم بوویەوە کە لەسەردەمی هاوەڵاندا، بەتایبەت سەردەمی عومەری کوڕی خطاب (خوا لێی ڕازی بێت) سەردەمی زێڕینی فیقهی ئیسلامی بوو، هەموو زاناکانی هاوەڵان لێی دەرنەچوون و دەریش بچوونایە هەر پەیوەندی زانستیان پێوەی دەما، نامە گۆڕینەوەیان هەر هەبووە لە چارەسەرکردنی مەسەلە فیقهی و بیروباوەڕیەکان.

عومەر (خوا لێی ڕازی بێت) زاناکانی ناو گەورە هاوەڵانی قورەیشی لە مەدینە و لەناو خاکی حیجازدا دەهێشتەوە، بەمۆڵەتی ئەو نەبوایە نەئەچوونە دەرەوە لە مەککە و مەدینە، ئەو بەسەریانەوە چاودێربوو.

کاتێ عومەر وەفاتی کرد و عوثمانی کوڕی عەففان هاتە سەر حوکم و مۆڵەتی زانایانی هاوەڵانی دا بە شارە گەورەکانی وڵاتی ئیسلامدا بڵاوەبکەن، زانستی دروستی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)بگەیەنن بە هەرێمەکان. ئیتر هەریەکەیان قوتابخانەیەکیان پێکهێنا لەو شارانەی کە تیایدا جێگیربوون. لەوانیشەوە خەڵکی ڕێچکەی فیقهیان دەگرتە بەر و فەرموودەیان لێ دەگێڕانەوە.

هەر کە سەردەمی شوێنکەوتووان هات کە هەموویان قوتابی بەردەستی گەورە هاوەڵانی پێغەمبەربوون (صلى الله عليه وسلم) عیلم و فەتوای ئەو هاوەڵە بووبووە مەزهەب و ڕێڕەوی ئەو شارانەی تیا نیشتەجێ بوو بوون، هەر لایەك عورف و عادەتی خۆی هەبوو، هەموو ئەو فەرموودانەیان دەگێڕایەوە کە لەو هاوەڵەی نیشتەجێی شارەکەیانەوە بیستبوویان، بەبۆنەیەوە جۆرەها بیر و تەفکیری فیقهی جیاجیا هاتە کایەوە و هەریەکە و دەیان ویست فەتواو کۆششە فیقهییەکانیان لە قورئان و فەرموودەی صحیحەوە سەرچاوە بگرێت.

* کە سەردەمی تابعین هات، ماوەی نێوان زانا فیقهییەکانی ڕاوبۆچوون و زاناکانی پابەند بە دەقەکانەوە فراوانتر دەبوو. تا وای لێهات هەریەکەو مەدرەسەیەکی جیابوو بۆ خۆی و شوێن کەوتووانیان لە زیادبووندا بوو.

جیاوازیەکەش لەوەدا نەبوو کە کار بە سوننەت بکەن یان نە، بەڵکو لە دوو شتدا بوو: یەکەم: کارکردن بە ڕاوبۆچوون، وردکردنەوەی مەسەلە وردەکان لەژێر سێبەریدا، بەلام دەستە (الأثر) بەناچاری نەبوایە ڕای خۆیانیان بەکار نەئەهێنا، هەروەك چۆن موسوڵمان لەناچاریدا گۆشتی بەراز دەخوات، نەئەچوونە

وردەکاریەکانی مەسەلە فیقهییەکان، ئەو مەسەلانەیان تاوتویێ نەدەکرد کە هێشتا ڕووی نەداوە و هەموو فەتواکانیان بۆ ئەو شتانە بوو کە ڕۆژانە ڕوویان دەدا. بەڵام زاناکانی(الرأی)فەتوای زۆریان دەدا بە ڕاوبۆچوونی خۆیان لەو مەسەلانەدا کە فەرموودەی لەبارەوە نەهاتبوو، لە کۆشش و هەوڵەکانیاندا تەنها بە مەسەلە واقعیەکانەوە نەدەوەستان بەڵکو لە مەسەلە گریمانەیی یەکانیشدا فەتوایان دەدا، ئەحکامیان بۆ دادەنا بە ڕاوبۆچوونی خۆیان.

زۆربەی ئەهلی فەرموودە و(الأثر)لە حیجاز بوون، چونکە وڵاتی هاوەڵان بووە و شوێنی دابەزینی وەحی بوو، تابعینیش کە قوتابی بەردەستی ئەوان بوون ئاساییە کە وەك ئەوان وابوون و پەنایان نەدەبرد بۆ ڕاوبۆچوون، ئەوەشیان قوتابی ئەو هاوەڵانە بوون کە ڕاوبۆچوونیان کار پێ دەکرد، تەنها هەر ڕایەکانی ئەوانیان دەگوێستەوە، زۆربەی ئەوانەی بە زانای ڕەئی ناسرابوون لە عیراق بوون، چونکە قوتابی بەردەستی عبداللەی کوڕی مەسعود بوون (خوا لێی ڕازی بێت)، کە ئەویش لەوانە بوون کە زۆر کەم فەرموودەیان دەگێڕایەوە لە ترسی ئەوەی نەوەك شتێك بڵێن و ئەو نەیفەرموو بێت، بۆیە بو باشتریان زانیوە بەڕای خۆیان حوکم بدەن، بەڵام کە فەرموودەیەکی(صحیح)ی پێ گەیشت لەڕایەکەی خۆی پاشگەزدەبوویەوە. چونکە فەرموودەزانەکان زۆربەیان لە وڵاتی

حیجاز بوون، عیراقیش وڵاتی فره کەلتور و فەلسەفە بوو، بەکارهێنانی ڕاوبۆچوون دەگونجا لەگەڵ خەڵکە جیاجیاکاندا، بەتایبەت تا ئەو ساتەوەختەش فەرمووده لەلایەن کەڵە زاناکانی فەرموودەوە پوختە نەکرابوون.

* لەم سەردەمەی تابعین دا نێوانەکە فراوانتر بوو لەنێوان فیقهزانەکانی (الأثر) و (الرأی)، بەڵام هەر کە سەردەمی تابعی تابعین هات. نێوانەکە زیاتر فراوانتر بوو، بەتایبەت دوای ئەوەی زانا مەزنەکانی مەزهەبە فیقهیەکان هاتنە مەیدانەکە و ئەوانیش هەر لایەك و (ڕاوبۆچوون) یان (دەستگرتن بە پاشماوەکانەوە) کار پێ دەکرد. بەڵام هەردوو لا هەوڵیان دا لە هەردوو قوتابخانەکە سوودمەند بن زاناکانی حیجاز و زاناکانی عیراق کە چاویان بەیەکتری دەکەوت، زۆر شتیان لەیەك وەردەگرت و سودیان لەیەك دەبینی و زاناکانی حیجاز وازیان هێنا لەوەی بە پاشماوەکان (الأثر) ڕازی بن و هەوڵیاندا لەکاتی پێویستدا ڕاوبۆچوون (الرأی) بەکاربهێنن لەزانینی حوکمەکاندا. لەبەرامبەریشدا زاناکانی-ڕاوبۆچوونیش- بینیان کە فەرموودە وا نوسرایەوە و لە هەڵبەستراو و لاوازەکان جیاکرایەوە، هەستان بۆ پاڵپشتی ڕایەکانیان فەرموودەیان دەگێڕایەوە یان لەو ڕایانە پاشگەز دەبوونەوە کە فەرموودە هەبوو لەسەر پێچەوانەکەی .

### کەمێك ڕوونتری بکەینەوە

لەم سەردەمەدا شەپۆلی درۆ هەڵبەستن بەدەم پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) نەوەستا ئاڕاستەی لایەنەکان -کە هەر یەکەیان بۆ سەلماندنی بۆچوون و ڕایەکانیان بەزمان و قەڵەم- هۆکارێك بوو هەڵبەستنی فەرموودەکان و بڵاوکردنەوەی لەناو موسوڵمانانندا.

قازی (عیاض)ناوی هەندێ لە فەرموودەهەڵبەسەکانی هێناوە و باسی هۆکاری فەرموودە هەڵبەستنەکانیان بەدەم پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم)و دەڵێ: ئەوانە جۆرە کەسانێك بوون، لەوانە ئەوانە بوون کە فەرموودەیان هەڵدەبەست کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) شتی وای هەر نەفەرمووە، وەك سوکایەتی بە پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)، وەك زەندیقەکان، یان کەسانێکی تر کە گوایە خێردەکەن و دینداری دەکەن وەك خواپەرستە نەزانەکان کە فەرموودەیان هەڵدەبەست لەباسی گەورەیی و فەزڵی چاکەکردن. یان لەبەر ناو و شورەت دەرکردن وەك هەندێ فەرموودەناسە تاوانبارەکان -فسقە المحدثین- یان لەبەر دەمارگیری و بەڵگە دروست کردن، وەك ئەوەی بیدعەچی و مەزهەبچییەکان دەیان کرد. یان بۆ شوێنکەوتنی دنیاپەرستی و

بیانوهێنانەوە بۆ تاوانەکانیان و هەموو ئەم جۆرانەو لەهەموو چین و کۆمەڵەکاندا لای ئەهلی پیشە و زانستی پیاوناسی ناویان هاتووە.

کە هەندێکیان فەرموودەکە خۆیان هەڵئەدەبەست بەڵکو بۆ هەندێ فەرموودەی مەتن لاواز، ئەڕۆشتن سەنەدی بەهێز و مەشهوریان بۆ دادەنا، یان هەندێکیان سەنەدیان زیادەکرد یان کەم دەکرد، یان بە ئەنقەست بووە. یان بۆ ئەوەی لە خەڵکانی تری تێك دەدات، یان ئەوەیە خۆی لە نەناسیاوی ڕزگار دەکات. لەوانەش هەبوو درۆی دەکرد و ئەی فلان فەرموودەم بیستووە و نەشی بیستبوو، یان فلان کەسی بینیووە کە نەشی دیوە و فەرموودەی (صحیح)ی لێوە دەگێڕانەوە، یان هەندێکیان وتەی هاوەڵان یان پەندی پێشینانی عەرەبی و وتەی ژیرمەندانیان ئەدایە پاڵ پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)[٥٦].

ئەم شەپۆلی فەرموودە هەڵبەستنە لەسەردەمی کۆشش و دروستبوونی مەزهەبەکان دەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆ:

١. فەرموودەناسەکان ڕوویان کردە پوختەکردنی فەرموودە (صحیح)و ڕاستەکان و جیاکردنەوەیان لە دەم هەڵبەستەکان، تا پاك لە پیس جیابکرێتەوە، دیراسەی ڕاویەکانیان دەکرد و لە ژیانیان

---

[٥٦] تأريخ التشريع الأسلامي محمد الخضري لا٨٢.

دەکۆڵینەوە و ڕاست و ناڕاستیان لەیەك جیادەکردەوە، ڕاستگۆکانیشیان دەکرد بەچەند پلەیەکەوەو پاشان لە فەرموودەکە دەکۆڵینەوە و دەیانکێشا بەو شتە سەرەتاییانەی کە هەموو کەس لە ئیسلامدا دەبێت بیزانێت، یان بەو فەرموودانەی کە زۆر مەشهوربوون و زۆربەی هاوەڵان گێڕاویانەتەوە و گومان لە ڕاستییەکەیدا نییە، یان بە قورئان دەیانکێشا، ئەگەر بیانزانیایە پێچەوانەیەتی ڕەدیان ئەکردەوە، پاشان پێشەواکانی فەرموودە دەستیان کرد بە نووسینەوەی فەرموودەی(صحیح) و پێشەوا مالك لە(موطأ)دا و سوفیانی کوڕی عویەینە لەکتێبی: (الجوامع في السنن والآداب) و سوفیاني سەوری (الجامع الكبير في الفقة والأحاديث)ی نووسی.

٢. زانا فیقهیەکان ئەوانەی ئەهلی(رأی)بوون دەستیان کرد بە فەتوادان بەپێی ڕاوبۆچوونی خۆیان لە ترسی ئەوەی نەوەك فەرموودەیەك بەدەم پێغەمبەرەوە(صلى الله عليه وسلم) هەڵبەستن.

***

* عیراق لەم سەردەمەشدا وەك سەردەمەكانی پێشوو پشتیان بەڕاوبۆچوون بەستبوو، چونكە ئەمانیش لە تابعین و تابعی تابعین وانەیان وەرگرتبوو بۆیە زۆر فەتوایان دەدا.

(الدهلوی) دەڵێ: (لەدوای باسكردنی ئەهلی فەرموودە لەگەڵ بوونی مالك و سوفیان و ئەوانەی دوای ئەوانیش هاتن كەسانێك بوون تاوتوێ كردنی مەسەلەكانیان پێ ناخۆش نەبوو و لە فەتوادانیش نەدەترسان، دەیانوت: ((دین لەسەر فیقهـ ڕاوەستاوە دەبێت بڵاوی كەینەوە))، كەچی لە گێڕانەوەی فەرموودە دەترسان تا وای لێهات (الشجعی) ئەیوت: پێمان خۆشترە جگە لە پێغەمبەرەوە (صلی الله علیە وسلم) قسە بگێڕینەوە. ابراهیم النخعی دەیوت: بڵێم عبدالله یان عەلقەمە وتی پێم باشترە لەوەی فەرموودە باس بكەم.

ئەوانە فەرموودەی تەواویان لەبەردەستدا نەبووە كە بتوانن بەهۆیەوە حوكمەكان دەربهێنن، لە ئەهلی فەرموودە بنەماكانی بۆ داناوە، ئەو سنگ فراوانیەیان نەبوو تا بتوانن وتەی زانای وڵاتان بهێنن لێكۆڵینەوەی لەسەر بكەن، خۆیان بەشایستەی ئەوە نەئەزانی.

لەو باوەڕەدا بوون كە پێشەواكانیان لەئاستێكی زۆر بەرزدان و پێویست بە لێكۆڵینەوەیان ناكات، دڵیان تەنها لەلای هاوەڵەكانی

خۆیان بوو، وەك چۆن عەلقەمە دەڵێ: ئایا هیچ کام لە هاوەڵان لە عبداللەی کوڕی مەسعود زیاتر بوون لەزیرەکی (تثبیت)دا؟).

یان ئەبوحەنیفە ئەیوت: (ابراهیم فیقهزانتر بووە لە سالم، ئەگەر لەبەر ڕێزی هاوەڵێتی نەبوایە ئەموت: عەلقەمە لە (ابن عمر) زاناتربووە لە فیقهدا).

زیرەکی وووردی و لێهاتوویەکی وایان تێدابوو کە مێشکیان لە مەسەلەیەکەوە بۆ مەسەلەیەکی تر دەگوازتەوە، کە بتوانن لەسەر ڕۆشنایی وتەکانی مامۆستاکانیاندا مەسەلە فیقهییە نوێیەکان دەربهێنن، هەمووی خەریکی ئەوەبوو بۆی دروست بوو بوو، هەموو لایەنێکیش بەوەی خۆیان زۆر دڵخۆش بوون. لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە زاناکانی عێراق ئەوەندی لە فەرموودە گێڕانەوە ترساون، ئەوەندە لە فەتوادان و دەرهێنانی مەسەلەی فیقهی نوێ نەترساون، گوێیان بۆ زاناکانی شارەکانی تر نەگرتووە بە ئەندازەی ئەوەی گوێیان بۆ زاناکانی مەزهەبەکەی خۆیان دەگرت، دەرهێنانی مەسەلە فیقهییەکان لەسەر بنەمای وتەی ئەوان.

* لەگەڵ ئەوەی عیراقییەکان و شام ڕێك کەوتبوون لەسەر ئەوەی کە بە ڕاوبۆچوون کاربکەن، حیجازیەکانیش تا فەرموودە و ئایەتی قورئان وەستابێ پەنایان نەبردووە بۆ فەتوادان بەڕاوبۆچوون، بەڵام

دەبێ ئەوە بڵێین کە هەردوو لایان لەسەر ئەوە ڕێك بوون کە دەبێ بە قورئان و فەرموودەی (صحیح)کاربکەن. بەڵام لەوەدا لەیەك جیادەبوونەوە کە ئەهلی فەرموودە پەنایان نەئەبرد بۆ ڕاوبۆچوون مەگەر بەناچاری و لەکاتی نەبوونی فەرموودەدا لەسەر مەسەلەیەك. بەڵام ئەهی ڕاوبۆچوون ئەوەندی لە فەرموودە گێڕانەوە دەترسان ئەوەندە لە فەتوادان و کارکردن بە ڕاوبۆچوون نەدەترسان، هەردوولایان کە فەرموودەی(صحیح)یان پێ بگەشتایە لەڕایەکەی پێشوویان پاشگەز دەبوونەوە.

بینا لەسەر ئەمە، زاناکانی-ڕاوبۆچوون- کاریان بە فەرموودەی لاواز نەکردووە، بەڵام ئەهلی فەرموودە کاریان بە فەرموودە کردووە بەمەرجێ دەم هەڵبەست نەبێت.

ئیمام مالیك کە پێشەوای سەردەمەکەی خۆی بووە لە زانستی فەرموودەدا-لەگەڵ ئەوەدا کە زۆرجاریش ڕاوبۆچوونی کارپێکردووە-بەڵام تەنانەت کاریشی بە فەرموودەی (منقطع)و (مرسل) و (عمل اهل المدینە) کردووە و ڕاوبۆچوونی بەکارنەهێناوە وەك (ابن القیم)دەڵێت: مەگەر لە کاتێکدا هیچێ لەو فەرموودانە نەبووبێت.

* لەکۆتا سەردەمەکانی ئەبوحەنیفەدا وردە وردە هەردوولا لەیەك نزیك دەبوونەوە، ئەمەش بەهۆی ئەوەی هەردوو لایەنەکە پێکەوە کۆدەبوونەوە و پێکەوە گفتوگۆ و دایەلۆکیان دەکرد، زۆربەشیان مەبەستیان بووە کە جوانی شەریعەت ڕوون بێتەوە، ڕێزی تەواویان لێ دەنا، کە سەردەمی نووسینەوە هات هەرلایەنە و فەرموودەکانی بۆ لایەنی بەرامبەر دەخوێندەوە و لەبەر زۆربوونی ڕووداوەکان، تەواونەبوونیان ئەهلی فەرموودەش ناچاربوون پەنابەرن بۆ کارکردن بەڕاوبۆچوون، نووسینەوەی فەرموودەی(صحیح)و ڕاست و دروست و جیاکردنەوەی بەئاسانی لە لاوازەکان.

ئەهلی ڕەئیش وا زۆریێ لەوانەیان بینی کە فەرموودەیان لە هاوەڵەکانی پێغەمبەرەوە(صلی الله علیه وسلم)گێڕابوویەوە، کە خەڵکی وڵات و شارە جیاجیاکان بوو، وا کۆمەڵێکی زۆر فەرموودەیان هاتەبەردەست و بەهۆیەوە لە ئەهلی فەرموودە نزیك بوونەوە.

(ابو یوسف) لەهاوەڵانی پێشەوا ابو حنیفە بوو یەکێکیش بوو لەزانایانی ڕاوبۆچوون، دەستی کرد بەخوێندنەوەی پاشماوە (فەرمودەیی)یەکان و لەبەریشی کردن، بەکاریشی هێنان بۆ بەڵگە هێنانەوە لەسەر ڕاوبۆچوونە فیقهییەکانی، خۆ ئەگەر فەرموودەیەکی بدیایە پێچەوانە بوایە لەگەڵ ئەو ڕایەی ئەودا، یەکسەر وازی لە ڕایەکەی خۆی دەهێنا بۆ فەرموودەکە.

(ابن جرير الطبري)لەوبارەیەوە دەڵێ: (ابو یوسف ناسرابوو بە لەبەرکەری فەرموودە و دەچوو بۆلای فەرموودەناسەکان—المحدث— پەنجا تا شەست فەرموودەی وەردەگرت وپاشان ئەویش ئەیوتەوە بەخەڵکی تر). (محمد) هاوڕێکەی تری پێشەوا ابو حنیفە دەچووە خزمەت سوفیانی سەوری و فەرموودەی لێ وەردەگرت و بۆ ماوەی سێ ساڵیش هاوڕێیەتی پێشەوا مالکی کردووە و بۆ وەرگرتنی فەرموودە، ئا بەم شێوەیە نێوانەکەی نێوان ئەهلی فەرموودە و ئەهلی ڕاوبۆچوون لە تەسکبوونەوەدا بوو.

کە دواتر پێشەوا شافعی هات ڕێگایەکی مام ناوەندی گرت، کە نە بەوجۆرەی ئەهلی فەرموودەی دەکرد کە کاریان بە هەموو فەرموودەیەك دەکرد، مەگەر بەڵگەیەك هەبوایە کە فەرموودەکە (صحیحە)، نە بەو جۆرەشی دەکرد کە ئەهلی ڕاوبۆچوون بەتەواوی سنوری ڕاوبۆچوونیان فراوان کردبوو.

بەڵکو ئەو یاسای بۆ دانا و ڕێگاکانی تەسك کردەوە و تەختی کرد بە جۆرێ ئاسانی کرد کە قبولێ کراوبێت.

کە لەو بارەیەوە دەهلەوی لە (حجە الله البالغە)دا دەڵێ: شافعی لە سەرەتای دەرکەوتنی هەردوو مەزهەبی (ابو حنیفە)و(مالیك) بە ڕوونکردنەوەی بنەما و ڕێگاکانیان، جواب سەیری کردن، زۆرێ لە مەسەلەکانیانی وەلانا لەوەی کە لەسەریان بەردەوام نەبێت.

* بەکورتی جیاوازی نێوان ڕای زانایانی فەرمووده و ڕای زانایانی ڕاوبۆچوونمان ڕوونکردەوە، بەڵام کام ڕاوبۆچوونەی کە قسەی لەسەر دەکرێت، ئایا مەسەلەکە لە ئەو قیاس کردنەدا کە مەسەلەیەك دەلیلی لەسەر نەبێت، بەڵام حوکمی مەسەلەیەکی بەسەردا بدرێت کە دەلیلی لەسەر هاتووە؟یان ئایا مەسەلەکە لە گشتی ترە؟

ئەوەی بە وردی لە مەسەلەی ڕاوبۆچوونی هاوەڵان و تابعین بکۆڵێتەوە بۆی ڕوون ئەبێتەوە کە مەسەلەکە تایبەت نییە بە(قیاس)ەوە، بەڵکو قیاس و غەیری قیاسیش دەگرێتەوە، خۆ گەر بگەڕێینەوە بۆ سەرەتای دروست بوونی مەزهەبەکان ئەم ڕاستییەمان بۆ دەردەکەوێت کە گشتی بووە، لە سەردەمی مەزهەبەکانیشدا هەر مەزهەبە و بەجۆرێك پێناسەی ڕاو و بۆچوونی کردووە کە پێویستە بەکاربهێنرێت.

(ابن القیم) ئەو ڕاوبۆچوونانەی لە هاوەڵان و تابعینەوە بۆمان ماوەتەوە بریتییە لە: (ئەوەی دڵ لەدوای بیرکردنەوە و ووردبوونەوە پێی دەگات لەڕاستییەکان کە بەڵگەی ئەحەقیەتی تێدا دیارە).

ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ فەتوای هاوەڵان و تابعین و ئەوانەشی ڕێڕەوی ئەوانیان گرتووە، تێدەگات لەمانای (الرأی) کە بریتی یە لە: (هەموو ئەو فەتوایانەیان کە داویانە لەو مەسەلانەدا کە دەقی لەسەر نەهاتبێت، لەڕێگەی پەی بردن بە زانینی ڕۆحی ئاینەکەوە

بەشێوەیەکی گشتی)، یان ئەو شتانەی کە لەگەڵ حوکمە فیقهییەکاندا دەگونجێت بەڕای موفتییەکە، یاخود لەمەسەلەیەك دەچێت کە دەقی لەسەر هاتبێت، حوکمی ئەو وەردەگرێت.لەسەر ئەم ڕایە بێ-ڕاوبۆچوون زۆر گشتی ترە لە قیاس و بەجوان زانین-الاستحسان-[٥٧].

پێشەوا ئەبوحەنیفە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لەگەڵ هاوڕێکانیدا کاریان بە قیاس و(استحسان) و(عرف)کردووە. لەکاتێکدا پێشەوا مالك و هاوڕێکانی بە(قیاس)و(استحسان)و(مصالح المرسله)ش کردووە، لەو مەزهەبەشدا کارکردن بە(مصالح المرسله) زۆر تەشەنەی کرد، بۆیە نەرمی و گونجانێکی تێدا دروست بووکە بۆ هەموو سەردەم و کاتێك بشێت، لەهەمان کاتدا زۆر کەم کاریان بە قیاس کردووە و بەڵام (زۆر ڕۆچوون لە مەسەلەی (الاستحسان)دا. لەوبارەیەوە پێشەوا مالیك دەیوت: (((مصالح المرسله) نۆ لە سەر دەی زانستە، بەڵام بەمەرجێ هیچ دەقێك لە قورئان و فەرموودە یان فەتوای هاوەڵان و ڕەوشتی شاری مەدینەی لەسەر نەهاتبێت)).

شافعیش هات و، بەو جۆرەی نەکرد کە ئا بەو بەرفراوانییە کار بەو مەسەلانەی ئەوان بکات بەبێ بوونی دەقێك بۆ پاڵپشتی، دەڵێ:

---

[٥٧] الاستحسان:ئەوەیە موفتی لە مەسەلەیەکدا بەجوانی ئەزانێت کە لەبەراوردکردن لابدات بۆ مەسەلەیەکی تر کە لە هاوشێوەی ئەوە.

(من نابینم له شەریعەتدا کاری پێبکرێت جگە لە(قیاس))، واتە: بەراوردکردنی ئەو شتانەی دەقیان لەسەر نییە بەو شتانەی کە دەقیان لەسەر هاتووە، لەم حاڵەتەشدا دەڵێ کارکردنە بە دەق و شتێکی بیدعە و نوێ نییە لە شەریعەتدا، بەڵام بەکارهێنانی قیاس بەجۆرێکی بێ سنور و بەبێ بوونی هۆکار لە حوکمەکاندا، ئەوە بیدعە و داهێنراوە لە شەرعدا و دەڵێ: ((من إستحسن فقد شرع)) واتە هەر کەس (من بەجوانی دەزانم)ـی لە شەرعدا بەکارهێنا ئەو خۆی کردووە بەشەرع دانەر.

بۆیە کۆمەڵێ کۆت و بەند و بنەمای بۆ مەسەلەی (قیاس) دانا و خۆیشی پشتگیری دەکرد و بەرگری لێ دەکرد، تا وای لێهات پێش حەنەفییەکان کەوت لە نووسینەوە و جێگیرکردنیدا.

تا (الرازی) لەو بارەیەوە دەڵێ: (ئەوەی جێگای سەرسوڕمانە پشت بەستنی ئەبوحەنیفەیە بە قیاس، نەیارەکانیشی بەوە ڕەخنەی لێ دەگرن کە قیاسی زۆر بەکارهێناوە، لەکاتێکدا نە لەئەوەوە و نە لە قوتابییەکانیشییەوە نەبینراوە تاقە لاپەڕەیەکی لەو بارەیەوە بەجێ هێشتبێت، لە نووسین و باسکردنی سەرچاوەکانی فیقهدا و بە بەڵگە هەر نەیهێناوەتەوە، هەرگیز وەڵامی نەیارانی داوەتەوە لەوەی قیاس بەکارناهێنن، بەڵکو یەکەمین کەسێك لەسەر مەسەلەی قیاس دوابێت و بەڵگەکانی لەسەر هێنابێت پێشەوا شافعی بووە).

## فەتوای هاوەڵان و تابعین و ڕەوشتی شاری مەدینە

لەو مەسەلانەی کە زۆریێ لە گفتوگۆ و دەمەقاڵەکانی لە دەوور دەسوڕێتەوە و هەردوو دەستەی چ فەرموودە (الاثر) و چ دەستەی ڕاوبۆچوون (الرأی)، لەسەر ئەوەن کە کار بە فەتوای هاوەڵان بکەن، چونکە شوێنکەوتن لە داهێنراو باشترە، هاوەڵانیش خۆیان ئامادەی ژیانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)و هاتنی ئیسلام بوون، وتەی ئەوان لە ڕاستییەوە و لە تێگەیشتنی دروست بۆ ئیسلام نزیکترە، ئەوانە پێشەوا گەلێکن سەرمەشقن، زۆربەی زاناکان کاریگەر بوون بە ڕایەکانی ئەوان.

تەنانەت ئەبوحەنیفە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: ئەگەر لە قورئاندا شتێکم دەست نەکەوت و لە فەرموودەشدا نەبوو، ئەوە بە فەتواو ڕای هاوەڵان کاردەکەم و ڕای هەندێکیان وەردەگرم و ڕای هەندێکیشیان وەرناگرم، بەڵام ئەگەر مەسەلەکە گەیشتە ئیبراهی و شەعەبی و حەسەن و ابن سیرین و سەعیدی کوڕی موسەییب، ئەوکاتە هەوڵی خۆم دەدەم وەك چۆن ئەوان هەوڵی خۆیان داوە.

کەواتە ئەو ئاوا ڕێزی لە ڕای هاوەڵان گرتبێت لەکاتێکدا کە پێشەوای ئەهلی ڕاوبۆچوون بووە، دەی کەواتە ئەهلی فەرموودە و کەسانی تر شایانترە کە کار بەفەتوای هاوەڵان بکەن (خوایان لێ ڕازی بێت).

برێکی زۆر لە فەتواکانی هاوەڵانیان لەبەردەستدا بوو کە عەقڵ و مێشکی زاناکانی خەریك کردبوو. وەك مەشخەڵێك زۆر سودیان وەردەگرت لە هەوڵ و کۆششە فیقهیەکانیاندا، زۆر کاریگەری هەبووە لەسەریان، هەمان ڕێچکەی ئەوانیان گرتەوەبەر، ڕێزیان لە ڕاوبۆچوون و فەتواکانیان دەگرت و کردبوویان بەسەرچاوەی سێیەم لەدوای قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، خۆ ئەگەر لەسەر ڕایەك کۆببوونایەتەوە، زاناکانی دوای خۆیان پابەند دەبوون پێیەوە، ئەگەر ڕایەکی تاکە کەسییان هەبوایە و و بەڵام کەس پێچەوانەی نەبوایە. ئەوە زاناکان زۆربەیان کاریان بەو ڕایە دەکرد.

گەر هاوەڵان لە مەسەلەیەکدا چەند ڕایەکیان هەبوایە، ئەوە زاناکان ئەو ڕایەیان هەڵدەبژارد لە مەزهەبەکەی خۆیانەوە نزیکتر بوو، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی لەو ڕایانە لایان نەدەدا بۆ ڕای خەڵکانی دوای ئەوان.

زاناکانی زاناکان لەسەردەمی تابعین و موجتەهیدەکاندا لەسەر ئەم ڕێبازە بەردەوام بوون، ئیتر با وەك سەرچاوەیەکی فیقهیش ئاماژەیان پێ نەکردبێت، بەڵام وادیارە ئەم ڕێزەیان لە ڕای هاوەڵان بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە قورئانی پیرۆز بەبەرچاوی ئەوانەوە دابەزیوە و پەروەردەی دەستی پێغەمبەری خوان (صلی الله علیه

وسلم)و دەبێ ڕاوبۆچوونەکانیان لەوەوە وەرگرتبێت و بۆ کەسیش نییە کۆششی فیقهی بکات لە شتێکدا کە بیداتە پاڵ پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) یان پەیوەندی بەوەوە هەبێت، هاوەڵان ڕاوبۆچوونەکانیان تەنها بە کۆششێکی فیقهی نەدەزانی و بەس، بەڵکو نزیکترە لەوەی سوننەت بێت.

پاشان تابعین و شوێن کەوتووەکانیان بەوەی کە بەجۆرێ سەیریان دەکردن کە مامۆستای یەکەمیان بوون، کە مژدەی فیقهی ئیسلامیان بەگشت لا دەگەیاند و ئەوان وەك ئەستێرەیەك بوون بە نوری ئیسلام سەرزەویان ڕووناك دەکردەوە.

* ئەبوحەنیفە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لەو سەردەمەدا پەیدابوو، لەسەر دەستی زانایانی ڕاوبۆچوون و هەندی لە زانایانی فەرمووده دەرچوو بوو، لەسەر دەستی هەموو زاناکانی سەردەمی خۆی زانستی وەرگرت، کەواتە سروشتییە کاریگەری ئەوانی لەسەر بێت و بیشیانخاتە پێش ڕاوبۆچوونی خۆی.

دواتریش کاری کردە سەر پێشەوا شافعی، دەربارەی ڕاوبۆچوونیان دەیوت: ((آرائهم لَنا خَیر من آرائنا لأنفسنا))[58].

---

[58] اعلام الموقعین بەرگی ٢ ل١٤٣.

واته: (ئەو ڕاوبۆچوونانەیان بۆ ئێمە باشترە لە ڕاوبۆچوونەکانی خۆمان بۆ خۆمان).

یان پێشەوا شافعی لە پەیامە کۆنەکەیدا دەڵێت: ((هم فَوقنا في کل علم و اجتهاد و ورع وعقل و أحر استدرك به علیم وَ آرائهم لنا أحمد و أولي بنا من رأینا))[٥٩].

واتە: (ئەوان لەسەروی ئێمەوەن لەهەموو زانست و کۆشش و گوناهـ نەکردن و ژیری و هەموو کارێك زاناکان پێی بگەن و ڕاوبۆچوونیان بۆ ئێمە لە ڕاوبۆچوونی خۆمان بۆ خۆمان باشترە).

یان (ابن القیم) لە شافعییەوە لە کتێبی (إختلاف مالك)دا دەڵێت: ((زانستیش پلە پلەیە: یەکەم قورئان و سوننەت، دووەم کۆدەنگی لەسەر مەسەلەیەك ئایەت و فەرموودەی لەسەر نەهاتبێت، سێیەم: هاوەڵێك شتێك بڵێت و کەس نەیاری نەکردبێت، چوارەم: جیاوازی نێوان هاوەڵان، پێنجەم، بەراوردکردن–قیاس)).

* * *

[٥٩] هەمان سەرچاوە و بەرگ ١٩٦٧ .

# پێڕست


پێشەکی........................٦

مامۆستا و زانا (محمد أبو زهره)
کێیە؟.............................٧

پێشەکی چاپی یەکەم............١١

ڕێخۆشکەر.......................١٦

ژیانی ئیمامی ئەبوحەنیفە.........٢٦

ژیان و گەورەبوونی پێشەوا......٣٢

ئامۆژگاری شەعەبی بۆ پێشەوا..٣٨

مامۆستاکەی پێشەوا ئەبوحەنیفە٤٨

پێشەوا چووە جێگای
مامۆستاکەی..................٥١

پێشەوا نموونەی بازرگانی دەست
پاک...........................٥٤

تێڕوانینی سیاسیانەی پێشەوا....٦٠

ئاکامی شۆڕشەکان..............٦٣

دیسان بەیعەت.................٦٨

پێشەوا لە سەردەمی
عەباسییەکاندا.................٧١

لە عەباسییەکانیش هاتە دەنگ..٧٣

دوو ڕووداوی تاڵ بۆ پێشەوا.....٨١

پێشەوا حوکمی قازیەکان
هەڵدەوەشێنێتەوە.............٨٦

پێشەوا پۆستی باڵا ڕەد
دەکاتەوە....................٩٢

کۆچی دوایی پێشەوا...........٩٧

زانستی پێشەوا ئەبوحەنیفە و
سەرچاوەکانی...................١٠٢

وتەی زاناکان دەربارەی ئیمام
ئەبوحەنیفە.....................١٠٣

ڕەوشتەکانی پێشەوا ئەبوحەنیفە١٠٩

مامۆستاکانی پێشەوا...........١٢٤

جوانترین گفتوگۆی پێشەوا لەگەڵ
(محمد باقر)...................١٣٩

شێوازی تایبەت لە خوێندن و
ئەزموندا......................١٤٧

سەردەمی پێشەوا ئەبوحەنیفە..١٥٧

نێوان سوننەت و ڕاوبۆچوون....١٨٢

فەتوای هاوەڵان و تابعین و ڕەوشتی
شاری مەدینە..................٢٠٤